هەر (سەت) ی

ناردووە (سەت) ی

حکومەتی هەرێمی کوردستان-عیراق

وەزارەتی ڕۆشنبیری ژمارە ١٢

ڕێزمانی کوردی

٢



# میکانیزمە بنەڕەتییەکانی ڕستە سازی

## ڕێزمانی بوون و هە بوون

د. شێرکۆ بابان

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| سفر | | | | | |
| سفر | +١ | | | | |
| سفر | +١ | +٢ | | | |
| سفر | +١ | +٢ | +٣ | | |
| سفر | +١ | +٢ | +٣ | +٤ | |
| سفر | +١ | +٢ | +٣ | +٤ | +٥ |
| گرت | دە | نە | هەڵ | بزی | خۆم |

وانەکانی ڕستە سازی - دکتۆرای زمانی کوردی

کۆرسی دووەم - ١٩٩٥/١٩٩٦

زانکۆی سەلاحەدین

هەولێر ١٩٩٧

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | سفر |
| | | | | -١ | سفر |
| | | | -٢ | -١ | سفر |
| | | -٣ | -٢ | -١ | سفر |
| | -٤ | -٣ | -٢ | -١ | سفر |
| -٥ | -٤ | -٣ | -٢ | -١ | سفر |
| با | بوو | ا | ر | نین | سووت |

ئەنجوومەنی وەزیران
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر
لێژنەی چاپەمەنی
ژمارە (١٢)

ناوی کتێب : میکانیزمە بنەرەتی یەکانی رستەسازی
نووسینی: د . شێرکۆ بابان
پیت چنین : نووسینگەی فردۆس بۆ کۆمپیوتەر
چاپخانە : چاپخانەی ئۆفسێتی کریستال لە هەولێر - ت ٢٢٤٦٠

# سوپاس و پێزانین بۆ

* وەزارەتی ڕۆشنبیری ، بۆ پشتگیری کردنیان لە چاپ کردنی ئەم کتێبەدا.

* وەزارەتی دارایی، بۆ ڕێزنانیان لە کتێبی یەکەمان (ڕستەسازی و شیتەڵکاری زانستی).

* نووسینگەی فیردۆس کە بە جوانی و بە وردی ئەم کتێبەیان پیتچن کرد.

* چاپخانەی کریستاڵ، کە زۆر هیلاك بوون بە ئەم ئیشەوە.

* ئەندازیار فەیسەل احمەد ئەبابەکر لە نوسینگەی ویندۆز، کە نەخشەی بەرگی ئەم کتێبەی بە جوانی ڕازاندەوە.

پێشکەشە :

* بە هەرسێ جگەر گۆشەکەم

برپار ، تەرزە ، کاڵێ

* بە دایکیان

# ⭑ وتەیەك ⭑

لە رووبەری ئەم نوسینەدا، زاراوەی (رێژەی بنەرەت ) بەرامبەر رووبەری (رێژەی رانەبردوو) دەوەستێت . بەلام (رێژەی رۆنراو) بەرامبەر بەرووبەری هەموو (رێژەی رابردوو) دەوەستێت .لە بەشی حەوتەم دا ئەوە دەسەلمێنێت کە (رانەبردوو) بریتییە لە (رێژەی بنەرەت )و لە بەشی شەشەم دا ئەوە دەسەلمێنرێت کە (رابردوو) بریتییە لە (ریژەی رۆنراو). لە لایەکی ترەوە پەنا براوە بۆ (خشتەی دارشتن )، واتە خشتەیەك کە هەموو رێژە گەردان کراوەکان هەڵ بگرێت (پەرەدایم :Paradigm ). مامۆستای پایەبەرز تۆفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەی دا پەنای بردووە بۆی وپاشان مامۆستا وریا عومەر ئەمین لە نامیلکەیەك دا کەبە ئنگلیزی بلأوکراوەتەوە لە لەندەن ساڵی ١٩٧٦ ، پەنای بۆ کەرەستەی ئاوا بردووە وبەجوانی هەموو رێژەکانی ریز کردووە . ئێمەش کەڵکمان وەرگرتووە لە ئەوان ولە هەندێك سەرچاوەی تر بۆ دارشتنی گەردانەکان، (سەرچاوەی ٤٣،٤٦، ٤٨، ٤٩، ٥١، ٥٢) .

لە ئەم نووسینەدا دوو میکانیزمی بنەرەتی پێشان دراون . یەکەمیان میکانیزمی دەرچەرخانی ئەرکی جێناو (میکانیزمی دەرچەرخان ) ودووەمیان میکانیزمی رۆنانی رێژەی رابردوو (میکانیزمی رۆنان ) . ئەم دوو میکانیزمە وەك هەن لە زمانەکەدا بەلام دیاری نەکراون وئەوەی باس کراوە وباس دەکرێت باسی ئەنجامە دیارو ئاشکراکانی ئەو دوو میکانیزمە یە . بۆ نموونە هەموو رێزماننووسان دەزانن کە ئەرکی جێناو دەگۆرێت لە نێوان رێژەی رانەبردوو ورابردوودا . تەنانەت مامۆستا وریا عومەر ئەمین ئەو ئەرك گۆرکێیەی بەجوانی نیگارکێشاوە لە نێوان هەردوو رێژەکەدا (سەرچاوەی ١١) .لە لایەکی ترەوە مامۆستای بەرێز مەسعوود محەمەد حەشارگەی کاری (ئینتقالی پێچەوانە ) دا زۆر بەوردی و بە زیرەکی بۆ کێشەکە چووە ولە پاشتردا باسی کەسی سێیەمی تاکی کردووە لە رووی جێناوەوە (سەرچاوەی ٧) . لە راستی دا کەڵکێکی زۆر لە کارەکانی ئەو دوو مامۆستا بەرێزە وەرگیراوە بۆ گەماروداني کێشەی (میکانیزمی دەرچەرخان ) . لە ئەم روانگەیەوە رەنگە ئەم ئیشەی ئێمە وەڵامێك بێت بۆ هەمووان چونکە ئەوەی هەست کراوە پێ ی بریتییە لە ئەنجام و لە کاردانەوەی ئەو میکانیزمانە لە گوفتاردا .

سەبارەت بە لێلی وتەم و مژ رەنگە لە سەرانسەری ئەم نووسینەدا ئەم بارە لێل ولەنگانە بەرچاو بکەون :

یەکەم : دووبارە بوونەدەی هەندێك لە بابەتەکان .

دووەم : زۆر کردن لە هەندێك ڕێژە کە دەڵێت بەمەکینە داتاشراوە.
سێیەم : ڕیزکردنی هەندێك ڕێژە کە برەویان نییە لە زمانەکەدا .
چوارەم : پێش ودوا خستنی هەندێك لە بابەتەکان . بۆ نموونە دەبا بەشی حەوتەم وشەشەم جێ گۆرکێ بکرابا پێیان .
پێنجەم : بەکار هێنانی هەندێك زاراوەی نوێ وتەکنیکی نوێ کە ڕەنگە خوێنەر هۆگریان نەبێت .

بەرامبەر بەئەم بارە لەنگانە داوای لێ بوردن دەکەین لە بەر ئەوەی بابەتەکە زۆر زۆر وردو ناسکەو نوێیە . لە گەڵ هەموو ئەوەیش دا چەند خاڵێك هەیە کە ڕەنگە ئێمە بە شێوەیەکی پارچەیی وجێگەیی بە هەڵەدا چووبین تێیدا ، وەك :

١- هەرچەندە جۆرەکانی (بوون) بە جوانی لە یەکتری جودا کراونەتەوە بەڵام زۆر دوور نییە لە هەندێك نموونەدا هەڵە ڕووی دا بێت بە تایبەتی لە نێوان (بوون) و(هەبوون) دا .

٢-ڕێچکەی نادیاری لە جێناوی کەسی سێیەمی تاك بەتەواوی بەکلایی کراوەتەوە، بەڵام لە ئەلبوومی مۆرفیمی ئێستایی دا تەم ومژ هەرماوە. بەتایبەتی لە ڕوخسارەکانی ئەم مۆرفیمەدا ، کە ڕەنگە لە هەندێك نموونەدا هەڵە ڕووی دابێت .

٣- لە ڕەنگ دانەوەی دەمکات لە ڕێژەدا ڕەنگە بابەتە زۆر (گەیشتوو) نەبێت ورەنگە بەرو بۆچوونی تریش هەبێت ورەنگە هەڵەش ڕووی دابێت . جۆرە بابەتی ئاوها پێویستی هەیە بە لێکۆڵینەوەی تایبەتی .

بە ئەم شێوە بە داوای لێ بوردن دەکەین ئەگەر بابەتەکە زۆر خەست وچڕ بێت یان ئەو بارە نادروستانەی کە لە پێشتردا باس کران ، دەرکەوتووبن ئەوەش بەدەستی خۆمان نییە وزمانەکە زۆر گرانە وئەو بابەتانەی کە باس کراون زۆر زۆر پێویستن بۆ ڕێزمانەکە چونکە هەن .

سەبارەت بەڕێبازی لێکۆڵینەوە لەئەم کتێبە دا، ئێمە لەهەموو نووسینەکان دا ئەو کەرەستەیە (عُدة Tool) بەکار دەهێنین کە لەدوماهیی ئەم برگەیەدا نیگاری کێشراوە. ئەو نیگارە بریتییە لە(نەخشەی ناخی بیر) بۆ ئەو خانانەی کە رەگەزەکانی ڕستەسازی هەڵ دەگرن. جێگای ئەندازیارییانەی ئەو خانانە بەهیچ جۆرێك هەرمەکی وبەرپووت نییە وبەتەواوی مل کەچن بۆ بنەماو یاسا. لەگەڵ ئەوەیش دا نەخشەکە ناتوانێت هەموو خانەکان بەیەك ڕستە پڕبکاتەوە چونکە بۆ ئەوە ڕۆنراوە کەهەموو ڕووبەری زمانەکە ڕابماڵێت. پاشان ئەو جێگایانەی کەبێ بارگە دەبن، دەبن بەخانەی بۆش و لەئاخاوتن دا ون دەبن بەڵام لەتەونی بیردا هەر ماون وهەر دەمێنن وجێگای خۆیان دەپارێزن. ئەوەیش

لەیاد نەکەین کەئەو نەخشەیە کۆتایی ڕێگاکە نییە وتەنها رووبەری ئەم کتێبە دادەپۆشێت لەئاستی ئێستای لێکۆڵینەوەکان دا. ئەو بابەتانەی کەدیاری کراون، یەکلایی بوونەتەوە و بەلاّم هەندێك بابەت وهەندێك وردەکاری بێ بایەخ کراون چونکە پێویست نین لەئێرەدا. سەبارەت بە مێتۆدۆلۆژیو بەکار هێنان ئێمە زۆر جار بەژمارە وبەزاراوەی خانە وبە بارگەو رەگەز و بەجێ گۆڕ و جێ نەگۆڕ دەدوێین. لە هەموو ئەو بارانەدا خوێنەر دەتوانێت پەنا ببات بۆ ئەو کەرەستەیەو سەرداوی بابەتە پەیت و لێڵەکان بدۆزێتەوە.

لەلایەکی ترەوە، ئەو نەخشەیە بۆ ئەوە دارێژراوە کە ببێت بە پالێوەرو بەشانە بۆ پالاوتن وشانە کردنی هەر (وشە)یەك، یان هەر (ڕێژە)یەك، یان هەر (رستە)یەك کەلەسەر بنچی کردارێك، (خانەی سفر)، ڕۆنرابێت. ئەو کە رەستەیە بەکارێتیی خۆی پێشان داوە لە(وشەرۆنان)دا و لە (دارشتنی ڕێژە)دا و لە (میکانیزمە بنەرەتییەکانی رستەسازی)دا و لە (ڕێزمانی بوون و هەبوون)دا.سەبارەت بەجێگۆڕکێی جێناوی لکاو، خانەی (-٦) بریتییە لەگالیسکەیەکی جێگۆڕ وئەگەر هەل وەمەرجی جێگۆڕکێ پەیدابوو ئەوا باز دەدات بەسەر ئەو پێنج جێبازەدا ولەسەر دوا پلە دەوەستێت. ئەو خانەیە جێگۆڕکێی (بکەر) و(بەرکار) دادەپۆشێت لەرووبەری زمانەکەدا.

ئەم ڕێبازە لەلێکۆڵینەوەدا بریتییە لە مێتۆدۆلۆژیی کتێبی (رستە سازی وشیتەڵکاری زانستی) کە لە کۆتایی ساڵی ۱۹۹٦ بلاّو کرایەوە. ئەمەش نەخشەی ئەو ڕێبازەیە کەلەسەر لاپەڕەی داهاتوو رەنگ ڕێژکراوە. لەسەر لاپەڕەی پاشتر، ئەو هەڵسەنگاندنە زانستی یە دووبارە دەکەینەوە کە لە فاکولتی ماتماتیك و زانستی کۆمپیوتەر لە زانکۆی ئەمستردام دەرچووە. لە ئەو بەڵگەنامەیە دا بابەتەکە بە پلەی (أصیل : رەسەن) هەڵ سەنگێنراوە. پاشان کاکڵەی تێکرای باسەکان کراوە بە لێکۆڵینەوەیەك لە راپۆرتێکی زانستی دا (سەرچاوەی ٤٢) لە زانکۆی ئەمستردام بلاّوکراوەتەوە لە ژێر ژمارە (LP-95-02) و ئەمجا تۆمارکراوە لە ئەوێ بە ژمارە (ISSN:0928-3307) .

## کەرەستەی ڕێزمانی: (پلکینەی ڕستە)

(...) : ............

(...) : ............

(+٦) : بکەری جودا.

[+٥] : بەرکاری جودا.

**(٥) : جێبازی پێنجەم (بەرکار).**

[+٤] : خانەی ئامرازەکانی پەیوەندی (لکاوو نەلکاو)

**(٤) : جێبازی چوارەم (ئامراز)**

[+٣] : خانەی پێشگری واتا گۆڕ

**(٣) : جێبازی سێیەم (پێشگر)**

[+٢] : خانەی نەرێ (نە، نا، مە، نی).

**(٢) : جێبازی دووەم (نەرێ)**

[+١] : خانەی پێشکاری بەردەوامی (دە، ب)

**(١) : جێبازی یەکەم (بەردەوامی)**

[٠] : خانەی سفر خانەی نەجێگاو (سوونت، گر، ...)

[-١] : خانەی ڕەگەزی تێپەڕاندن (ێن، ان).

[-٢] : خانەی بکەر نادیاری (ر)

[-٣] : خانەی نیشانەکانی ڕابردووی نزیك (ا،د،ت،ی،و)

[-٤] : خانەی ڕابردووی دوورو تەواو (بوو،و)،

[-٥] : خانەی ڕستەی نیازداری و گومانداری لەڕابردوودا،

**(-٦) : خانەی جێناوی لکاوی (جێ گۆڕ)**

(-٧) : خانەی جێناوی لکاوی (جێ نەگۆڕ)

[-٨] : خانەی پاشگری دووپات کردنەوە (ەوە).

(...) : ------------------------

(...) : ------------------------

★ هەڵسەنگاندنی زانستی ★

ئەمستردام: ١٩٩٥/٣/٢
ژمارە: IU15
خاوەن پەیوەندی: جەی. ئیف. کەی. ڤان بنتەم
ڤاکولتی ی ماتماتیك وزانستی کۆمپیوتەر
زانکۆی ئەمستردام.

Plantage Muidergracht 24
1018 TV Amsterdam
e-mail : John @ fwl
uva. nl

## بۆ ئەو کەسەی کە ئەم ئیشە بایەخدارە لەلای

- ئەمە ئەوە پات دەکاتەوە کەوا دکتۆر *شێرکۆ عبدالکریم توفیق بابان*، سەردانی کرد بۆ پەیمانگای مەنتیق و زمان و کۆمپیوتەر لە زانکۆی ئەمستردام لە هۆڵەندا، لە ١٩٩٤/١٢/٩ تا ١٩٩٥/٣/٧*.
- لە کاتی سەردانەکەی دکتۆر بابان روو بەروو بووەوە لەگەڵ چەندین توێژەرەوە لە بواری زمانەوانی بە کۆمپیوتەر ولەبواری مەنتیق دا، لەناو پەیمانگاکەو لەدەرەوەی.
- هەروەها ئیشە رەسەنەکەی خۆی (Original Work) پێشکەش کرد، دەربارەی رێزمان بە پرۆگرامی کۆمپیوتەر بۆ زمانی کوردی و بۆ زمانی ئنگلیزی، لە یەکێك لە کۆنگرە زانستی یەکانمان دا.
- ئێمە دڵخۆشین بەبلاوکردنەوەی راپۆرتێکی پەیمانگەکە بۆ بەڵگە رێژکردنی نەخشەی زانستیانەی کردەوەی هەڵ سوڕاندنی زمانی سروشتی بە کۆمپیوتەر.
- ئێمە هەست دەکەین کەوا سەردانەکە زۆر کەڵك داربوو چی بۆ دکتۆر بابان وچی بۆ پەیمانگەکەمان و بەهیواین کەوا بەردەوام بێت لە بواری زانستی زمانەوانی بە کۆمپیوتەردا.
- ئێمە شتی زۆر فێر بووین لەئەم دیدەنە لەگەڵ یەکێك لە هاورێ کوردەکانمان.

دڵسۆزتان
پرۆفیسۆر
دکتۆر جەی. ئیف. کەی. ڤان بنتەم
ئەمستردام، ئازاری ١٩٩٥

---

* بە پێی نووسراوی زانکۆی ئەمستردام ژمارە (6051) لە (١٩٩٤/٨/١٦)، ئێمە داوەت کرابووین بۆ سەردانێکی زانستی بۆ ماوەی چوار مانگ. ئەم گەشتە لەسەر داخوازی زانکۆی سەلاحەدین (هەولێر) رێك خرا بوو.

# ★ ناوەڕۆك ★

## بەشی پێنجەم



## بەشی شەشەم



## بەشی حەوتەم

# بەشی یەکەم

## سەرەتایەکی پێویست

١: ١- **پێشەکی** :

زۆر جار وا بەرچاو دەکەوێت کە [بوون] کردارە و زۆر جاریش دەوترێت کە کردار نییە. لە لایەنی ئێمەوە [بوون] کردارە و بەلام بەرهەلستی لە ئەوەش ناکەین ئەگەر بوترێت کردارێکی یاریدەدەرە یان کردارێکی ناتەواوە. لە بواری [بوون و هەبوون]دا، نووسین زۆر زۆر کەمە و ئەوانەش کە هەن هیچ نادەن بەدەستەوە و لەیەکتری جودا ناکرێنەوە لە ناوەڕۆکەوە. هەموویان لە باری پانی و درێژی دەکۆڵنەوە و هیچیان دەست داناگرن بەرەو ناخی زمانەکە و بەرەو کاکڵەی زانستی لە توێژینەوەدا. لە لای ئێمە رێزمانی (بوون و هەبوون) ، پەراوێزێکی زۆر درێژە و چەندین لێکۆڵینەوە لە ئامێز دەگرێت. ئەم نووسینەی بەردەست بریتییە لە پانۆرامای ئەو بۆچوونانە، یان ئەو کاکڵە زانستییانەی کە هەتا ئێستا تۆمار کراون. ئەم سەرنجانە رەنگە هەموویان کۆتایی رێگا نەبن بەلام هەر هیچ نەبێت لە هەنگاوە سەرەتاییەکانن و دەبن بە هاندەر و هۆکار بۆ هەژاندنی هەموان بەرەو رێزمانێکی نوێ، بۆ زمانێکی هاوچەرخ و لەبار. ئەو یاسا و پۆلین کردن و خشتە و نموونانە، ئەگەر هەر وەك کاکڵەیەکی زانستی کەم بدەن بە دەستەوە بەلام وەك کەرەستە بێ کەڵك نین .

به هیواین خزمەتێکی بچووك پێش کەش بکەین بەرێزمانەکە. رێزمانی زمانێك کە گلەیی دەکات لە [بوون و هەبوون] و لە [ئامرازی پەیوەندی]. ئەم دوو ئاڵۆزیی‌یە زۆر زۆر بەکارترن لە [رەفتاری جێناوی لکاو] لە زمانەکەدا.[2] لە لایەکی ترەوە، ئەم زمانە کە چەندین سەدەیە دەسئوێت لە لاکۆلان دا بە زەبری بەکارهێنان، پێویست دەکات بەخزمەتێکی زانستی ئەوتۆ کە سوانی هەرەمەکی رابوەستێنێت. سەرەڕای ئەوە، دەبێت ساڵ بە ساڵ باری پەرەسەندن و سوانی رەنگ رێز بکرێت بە لێکۆڵینەوەی زانستی‌یانە.

لە رێزمانی نووسراوی زمانەکەدا، [رێزمانی کار] زۆر بێ خزمەتە و [رێزمانی جێناو]یش لە ئەو بێ خزمەت ترە و بەلام رێزمانی [بوون و هەبوون] هەر ناوبراوە و جار بەجاریش نموونە رێزکراوە. ئێمە دەڵێین رێزمانی [بوون و هەبوون] ئەلف و بێی رستە و رستە سازی‌یە و ئەو سەرەتایەیە کە مەکینەی رێزمان دەخاتە ئیش کردن. نووسەرانی رێزمان تا ئەمرۆ [بوون] و [هەبوون] بە [بوونی تێنەپەڕ] و [هەبوونی تێپەڕ] دەناسن و نازانن کە لە ئەم بۆ چوونەدا پێدەنێن لە ورگی [بوونی تێپەڕ] و [هەبوونی تێنەپەڕ]. هێشتا نازانن کە دیاردەی (وەرچەرخان) هەیە لەزمانەکەدا و [بوون و هەبوون] ئەگەر دوو کاری تێنەپەڕ بن بەلام ئەم دوو کارە دیوی تێپەڕیان هەیە. هەندێك لە نووسەرانی رێزمان [بوون و هەبوون] تێکەڵ دەکەن لەگەڵ [بوونی بوونایەتی] و نموونەی شاش و واش ریز دەکەن و رێزمانەکەش پەرپووت دەکەن.[3]

لە ئەم رووەوە، فەرامۆش کردنی [بوون و هەبوون] و نەزانینی بنج و بنەڕەتی لەرووی ڕێزمانەوە شتێکی زۆر دژوارە و ڕێگا دەگرێت لە پەرەسەندن و لە پەیدا بوونی زمانی نووسین. بەئەم شێوەیە ئێمە پێویستیمان هەیە بە ڕێزمانێك کە چاوی بیر هەڵی بگرێت، نەك بە هێزی لە بەرکردن بەسەردا بسەپێت، یان بەرێزمانێك کە توانای زانستیانە و مۆرکە جوانەکان و مۆرکە رەسەنەکانی زمانەکە بکات بە خۆراکی بیر و زمانەکە پاك بکاتەوە لە پەڕپووتی و هەڕەمەکێتی لەنووسین دا. پاشان ئەو ڕێزمانە بتوانێت ئەو کێشانە لێك بداتەوە کە بە (نارێکی) و (مەتەڵی ڕێزمانی) ناسراون هەتا ئێستا. ئێمە پێویستیمان هەیە بەئەو ڕێزمانەی کە ئێسك بێت لە نێو لەش دا، یان وەکوو بنەڕەت و هەیکەل بێت لە تەلاردا، یان وەکوو خشتەی لێکدان (جدول الضرب) لەبیرکاریدا.

سەبارەت بەئەو نووسینانەی کە تا ئێستا نووسراون لەسەر بوون و هەبوون چەند بەرهەمێك هەیە. بەلام وەك [ڕێزمانی بوون و هەبوون] بەداخەوە زۆر کەمە و ئەو بەرهەمانەش هەموو ڕێزمانەکەی داناپۆشن.[4]

لەکاتی نووسینی ئەم بەرهەمەدا کەڵك وەرگیراوە لە چەند سەرچاوەیەك کە پەیوەندی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ یان هەیە لەگەڵ ئەم بابەتەدا. تێکرای ئەم سەرچاوانە و سەرچاوەکانی تر لە ڕێ یەکی ترەوە رووودەکەن لە [بوون و هەبوون] ئێمەش لە ڕێیەکی ترەوە، ئەو ڕێیە بریتییە لە، دەرخستنی میکانیزمە سەرەتاییەکان، وەك دیاردەی جێگۆرکێ و دیاردەی ئەرك گۆرکێ و دیاردەی یاریدەدان. بەلام بەشێوەیەکی گشتی ڕێبازی ئەم

نووسینە زۆر زۆر جیاوازە لە رێبازی ئەو نووسینانەی کە باس کران. ئەوان ئەگەر هەستیان کردبێت بە دیاردەیەکی پەنامەکی و بێناز لە رێزمانەکەدا، ئێمە هەوڵ دەدەین میکانیزمە سەرەتاییەکانی بدۆزینەوە و زمانەکەی پێبدەین لە خشت بڕی رێزمان. ئەمجارەیش دووبارەی دەکەینەوە و دەڵێین زۆر جێی شانازی بوو ئەگەر هەموو لایەنەکانی [بوون و هەبوون] ئاشکرا بووبان و ئێمەش بە بیر گوشین لە نێو ئەو بەرهەمانەدا بۆ بیرکاری زمانەوانی بگەڕابین. وەکوو گلەیی یەك لە خۆمان دەڵێین رێزمانەکە بە گشتی و بوون و هەبوون بە تایبەتی بێ خزمەتن، ئەوەش شتێکی ئاشکرایە لە لای ئەو بەرێزانەی کە نووسین و بەرهەمیان هەیە لە ئەم بوارەدا.

## ١: ٢ – نوێنی جۆرەکانی [بوون][٦] :

لە بەر ئەوەی لەسەر روخساری [بوون]، بە تایبەتی لە دۆخی رابردوودا، چەند جۆرێك لە کردار دەردەکەوێت بە پێویستمان زانی کە ناوی جۆرەکان بنێین. لە یەکەم هەنگاودا ئەم سێ جۆرە هەن :

جۆری یەکەم : بوونی [بوونایەتی] : ئەم کردارە لەرانەبردوودا بنجەکەی دەردەکەوێت، وەك:

مندالەکە زیر دەبێت

یان،

مندالەکە زیر دەبێتەوە

یان،

چۆن وا دەبێت ؟

جۆری دووەم : بوونی [بوون] : ناو نانی ئەم جۆرە ئەم کردارە لەسەر ئەو ئەندازەیە یە کە لە ڕێژەی ڕانەبردوودا ڕەگەکەی نادیارە [—] ، وەك :

من مامۆستا [-] م

یان،

تۆ هەر خۆت [-] (یت)

ئەم جۆرە ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە ئەرکی پاڵپشتایەتی دا و دەتوانێت پشتی زۆر وشە بگرێت. بە ئەم پێیە دەتوانین ئەم جۆرە ناوبنێین [بوونی پاڵپشتایەتی] یان [بوونی یاریدە]، یان [بوون] بەتەنها.

جۆری سێیەم : بوونی [هەبوون] : ناو نانی ئەم جۆرە لە ئەوە وە هاتووە کە واتای [هەیی] دەبەخشێت لە [ئارا]ی کەسێك یان شتێك دا. دەتوانین ناوی بنێین بوونی [هەیی] یان بوونی [ئارایی]، بەلام جوانترین ناو [هەبوون] خۆیەتی. ئەم ناو نانە لەسەر ئەوئەندازەیە یە کە [هە] دەردەکەوێت لە [ڕەگی ڕانەبردوو]دا. وەك :

من [هە] م

یان،

## ئەو [هە] یە

ئەم سێ جۆرە بە ئاشکرا دیارە کە تێنەپەڕن بەڵام سێ دیوی تێپەڕیان هەیە، وەك[7] :

١- بوونایەتی :

- بوونایەتی تێنەپەڕ
- بوونایەتی تێپەڕ

٢- بوون :

- بوونی تێنەپەڕ
- بوونی تێپەڕ

٣- هەبوون :

- هەبوونی تێنەپەڕ
- هەبوونی تێپەڕ

لە ئەو سێ دیوە تێپەڕەدا جێگۆڕکێی جێناو هەیە، وەك جیاوازی‌یەك لە دیوی یەکەمیان. نموونەش ئەمانەن :

١- بوونایەتی تێپەڕ، وەك :

شیرین منداڵ (ی) دە-بێت

٢-بوونی تێپەڕ، وەك :

ئێمە چی (مان) بوو(-) ؟

٣- هەبوونی تێپەڕ، وەك :

ئێمە چی (مان) هەبوو(-) ؟

ئەم شەش جۆرە بەئەو شەش زاراوەیە لە نێو ئەم نووسینەدا بەرچاو دەکەون. لەگەڵ ئەم شەش جۆرەش دا چەندین کەرەستەو پارچۆلکەی تر هەیە کە بەروخسار لە ﴿بوون﴾ دەچن بەڵام ئەمە لە ئێرەدا باس ناکرێت.[8]

## ١ : ٣- بوونی بوونایەتی :

سەبارەت بە زاراوەی [رێزمانی بوون و هەبوون]، وەك لە رێزمانی نووسراودا ناودەبرێت، ئەم ناو نانە زۆر هەڵەیە و زۆر بێجێیە. برگەی [بوون] لە ئەو زاراوەیەدا بریتییە لە [بوونی تێنەپەڕ] و برگەی [هەبوون]یش بریتییە [هەبوونی تێپەڕ]. بەئەم شێوەیە [بوونی تێپەڕ : جۆری دووەم : دیوی دووەم] و [هەبوون : جۆری سێیەم : دیوی یەکەم] فەرامۆش کراون. سەبارەت بە [بوونی بوونایەتی]یش بەهەڵە دراوەتە پاڵ [بوون و هەبوون]، ئەم کردارە کردارێکی ئاسایی تێنەپەڕە وەك [کەوتن، خەوتن، چوون، سووتان ......]، هەر بەروخسار لە [بوون و هەبوون] دەچێت . نیتر پێویست ناکات نموونەی نابەجێی ئەم کردارە ریز بکەین لە رێزمانی [بوون و هەبوون]دا. ئەو بەڵگانەش کە [بوونی بوونایەتی] دەخەنە نێو ریزی [بوون وهەبوون] ئەمانەن :

یەکەم: لە روخساری رابردوودا [بوونایەتی] و [بوون] دەبنەوە بەیەك.

دووەم: [بوونایەتی] بگۆڕی [ێن] و بگۆڕی [ر] بۆ تێپەڕاندن و نادیاری وەر ناگرێت. ئەم دیاردەیە زۆر دەگمەنە لە کارە تێنەپەڕەکاندا.[9]

سێیەم: بوونی بوونایەتی هەر چەندە ئاساییە بەڵام وەردەچەرخێت وەك

[بوون و هەبوون]. ئەم دیاردەیە زۆر دەگمەنە لە کارە ئاساییەکاندا.

چوارەم: بوونی بوونایەتی پێشکارێك لە چەشنی پاڵ پشت وەردەگرێت،وەك

[گوڵەکە گەش دەبێتەوە]

ئەم دیاردەیە زۆر دەگمەنە لە کارە تێنەپەڕەکاندا و زۆر ئاساییە بۆ [بوونی جۆری دووەم]، وەك :

[گوڵەکە گەشە].

لە ئەو چوار خاڵە بترازێت بوونی بوونایەتی هەموو رەفتارێکی کاری ئاسایی هەیە تێی دا، وەك :

یەکەم: وەرگرتنی جێناوی لکاو [م، یت، ێت، ین، ن، ن] لە چەشنی کارە ئاسایی یەکان، کەچی لە [بوون هەبوون]دا جێناوی کەسی سێیەم [ێت] دەبێت بە [ە].

دووەم: نەگۆڕانی روخساری بنجەکەی، کە بریتییە لە پیتی [ب] بە پێی دەمکاتی رستە و بە پێی مەبەستی رستە لە [گومان و نیاز]. ئەم دیاردەیە لە [بوون و هەبوون] دا نییە.

سێیەم: وەرگرتنی پێشکاری بەردەوامی[دە]،وەك کردارە ئاساییەکان لە رانەبردوودا.ئەم دیاردەیە هەر نییە لە ئاستی[بوون وهەبوون]دا .

چوارەم: وەرگرتنی پاشگری دووپات کردنەوە [دوولۆبی]. پاشگری [ەوە]هەرنییە لە ڕێزمانی [بوون و هەبوون]دا.[10]

پێنجەم: وەرگرتنی پێشگری کارە ئاساییەکان،وەك :

[دابوون، رابوون، هەڵ بوون،رۆبوون]

ئەم پێشگرانە هەر نین لە ڕێزمانی[بوون و هەبوون]دا، هەرچەندە هەندێك نووسەر بە هەڵە دەیان کەن بەنموونە.

شەشەم: لە ئاوێتە بوونی پێشکاری [نەرێ] و [بەردەوامی]دا پێشکاری ئاوێتە[نا]دروست دەبێت، وەك:

[نە]+[دە] ← [نا]

کەچی بۆ بوون,هەبوون [نی] دروست دەبێت .

حەوتەم: وەرگرتنی [ئامرازی پەیوەندی] وەك کارە ئاساییەکان ، وەك:

شیلان دەبێت (بە) مامۆستا.

ئەم دیاردەیە لە ڕێزمانی [بوون و هەبوون]دا نییە .

هەشتەم: ڕێژەی بوونایەتی ڕانەبردوو وەك [گوڵەکە گەش دەبێت] واتای [داهاتوویی] دەبەخشێت بۆ کردارە ئاساییەکانە بەڵام [بوون و هەبون] لە ڕانەبردوودا هەر واتای [ئێستایی] دەبەخشن.

ئەمە بوو ئەوبەڵگانەی کە بوونی بوونایەتی جودا دەکەنەوە لە [بوون و هەبوون] و دەیخەنە ریزی [کارە ئاساییەکان] . لە بەشەکانی ئەم نووسینەدا ئەو خاڵانە بە تەواوی ساخ دەکرێنەوە.

## ١ : ٤ – بوون و هەبوونی تێنەپەڕ :

چەند بەڵگەیەك هەیە دەری دەخات كە بوونی تێنەپەڕ و هەبوونی تێنەپەڕ لە ڕێزماندا زۆر لە كردارە ئاساییە تێنەپەڕەكان دەچن، ەوك:

یەكەم : پرسیار دروست دەكەن وەك كاری ئاسایی، وەك :

ئایا شیلان دەڕوات ؟

ئایا شیلان زیرەكە ؟

ئایا شیلان هەیە ؟

دووەم : جێناوی گەیەنەر (كە) وەردەگرێت وەك ڕستەی دووەمی گوفتار، وەك :

ئەو حەز دەكات لە ئەو شتەی كە جوانە

ئەو حەز دەكات لە ئەو شتەی كە هەیە

سێیەم : وەرگرتنی ئامرازی سووربوون (یش)، وەك :[١١]

ئەو زیرەكیشە

ئەو هەیشە

چوارەم : مەبەستی ڕستە لە نیاز و گومان دەردەخەن، وەك :[١٢]

خۆزگا ئەو مامۆستا با

ڕەنگە ئەو مامۆستا بێت

خۆزگا ئەو هەبا

ڕەنگە ئەو هەبێت .

پێنجەم: رستەی فەرمان دروست دەکەن لە دیوە تێنەپەڕەکان دا :

تۆ کپ بە ، یان ئێوە کپ بن

تۆ هە بە ، یان ئێوە هە بن

شەشەم: لە رووی جێناوەوە وەك کاری ئاسایی ین، تەنها بۆ کەسی سێیەمی تاك نەبێت.

لە بوونی تێپەڕ و هەبوونی تێپەڕدا ، ئەو خالانەی سەرەوە هەن و سەرەڕای ئەوانە جێگۆڕکێ و ئەرك گۆڕکێ هەیە. ئەمەیە پەیوەندی یە بەرچاوی یەکانی بوون و هەبوونی تێنەپەڕ لەگەڵ کردارە ئاسایی یەکاندا. سەرەڕای ئەمانە رەنگە چەندین پردی تر هەبێت بەلام لە ئەم بەشەدا هەر ئەوەندە بەسە.

١: ٥ – بوون و هەبوونی تێپەڕ : لە رەفتاری بوونی تێپەڕ و هەبوونی تێپەڕدا، چەند رەفتارێکی نا ئاسایی هەیە کە جودایان دەکاتەوە لە کارە تێپەڕە ئاسایی یەکان. ئێمە لە ئێرەدا ئەو رەفتارانە بەسەر [هەبوونی تێ پەڕ]دا، نموونە رێژ دەکەین و بە ئەم چەشنە :

یەکەم: لە کرداری ئاساییدا، رابردووی نزیك دەتوانێت یەك برگەیی بێت، وەك :

[گرت] (م)

کەچی [هەبوون]، لە رابردووی نزیك دا، هەر دوو برگەیی دەبێت، وەك:

[هە] (م) [بوو].

ئەگەر ئەو رستەیە نووسرا وەك :

[هە] [بوو] (م)

ئەوا واتاکەی بەراویتە دەبێت.

<u>دووەم :</u> کراری ئاسایی لە رانەبردوودا دەتوانێت جێناوی بەرکار (ی) وەربگرێت، کەچی رێژەی رابردووی [هەبوون] وەری ناگرێت چونکە خۆی لە خۆی جێ‌پێی بەرکاری کەسی سێیەمی تاکی پێوە هەیە، وەك :

دە گرم ⟵ دە (ی) گرم

کەچی،

هە مە ⟵ هە (ی) مە (دروست نی‌یە)

<u>سێیەم :</u> بکەری [هەبوون] لە رانەبردووش دا جێگۆرکێ دەکات ئەمەش لە رەفتاری کرداری تێپەڕی ئاسایی جیاوازە.

وەك :

[هە] (م) [ە] یان [پارە] (م) [هە] [ی] [ە]

کەچی دەوترێت :

[دە ] [گر] (م) یان [دەست] [دە] [گر] (م)

<u>چوارەم :</u> کرداری [هەبوون] لەرابردوو و لە رانەبردوو دا هەمان ستوونی جێناو وەردەگرێت، ئەویش بکەری رابردوو لەکاری تێپەردا.

ئێمە [هە] (مان) [ە]

ئێمە [هە] (مان) [بوو]

پێنجەم: کرداری [هەبوونی تێپەڕ]، ڕێژەی فەرمان دروست ناکات وەك کردارە ئاساییەکان.

ئەم پێنج خاڵەی سەرەوە بە ئاشکرا دەمان بەن بەرەو دیاردەیەکی نەزانراو و ئەو بۆ چونە دەخەنە نێو بیرەوە کە [هەبوون] کردارێکی تێپەڕ بێت، بەڵام بە دیاردەی [وەرچەرخان].

# بەشی دووەم

## دەروازەیەك بۆ ڕێزمانی بوون و هەبوون

**٢: ١- دیاردەی وەرچەرخانی کرداری تێنەپەڕ[١٣] :**

یەکێك لە کردەوەکانی خانەی ئامراز ئەوەیە، کە کرداری تێنەپەڕ وەردەچەرخێنێت بۆ سەر ڕەفتاری تێپەڕ، وەك :

من [دارەکە] (م) [پێ(--)] [دە] [سووت] (ێت)

بە هەمان شێوە دەتوانین بڵێین :

من [بەش] (م) [پێ(--)] [دە] [کەو] (ێت)

ئەگەر لەم ڕستەیەدا بکەری ڕاستەوخۆ (جێگری بەرکار) لابیرێت، دەبێت بە :

من [ × ] (×) [پێ(م)] [دە] [کەو] (ێت)

ئەگەر لە ئەم ڕستەیەش دا [پێ]ی ئامراز لاچوو، دەبێت بە :

من [ × ] (×) [ × (×)] [دە] (م) [کەو] (ێت)

ئەم بارەی دوایی جوانترین نموونەی کرداری وەرچەرخاوە. لە ئێرەدا کرداری [کەوتن] لە جێی ئەوەی جێناوی تێنەپەڕ وەربگرێت جێناوی تێپەڕ وەردەگرێت.

لە ئەو نموونەیەدا چەند خاڵێك جێی دیاری کردنە، وەك :

<u>یەکەم</u> : جێبازی [ڕەگ] داگیر کراوە بە جێناوی کەسی سێیەمی تاك، (ێت).

<u>دووەم</u> : بە پێی خاڵی پێشوو جێناوی (م) ناتوانێت بچێتە سەر [ڕەگ].

سێیەم : بە پێی حاڵی یەکەم و دووەم دەبێت پێشکار بەکاربێت لەگەڵ [رەگ] دا، ئەویش لەبەر جێبازەکەی.

چوارەم: ئەم رێژەیە رابردووی نزیك و دوور و تەواو وەرناگرێت. بەلام هەر رابردووی بەردەوام وەردەگرێت، وەك :

من [دە] (م) [کەوت]

پێنجەم : ئەگەر پێشکاری واتا گۆڕ هات ئەوا جێناوەکە دەکەوێتە جێگۆڕکێ، وەك :

من [بەر] (م) [دە] [کەوت]

شەشەم :رابردووی نزیك و دوور و تەواو هەموی چالاك دەبنەوە، وەك :

من [ بەر ] (م) [ کەوت ]

یان، من [بەرم] (م) [کەوتبوو ]

یان، من [بەرم] (م) [کەوتووە ]

پاش ئەم پێشەکی‌یە دەتوانین بڵێین کرداری [کەوتن] دەتوانێت وەربچەرخێت بۆ تێپەڕهەرچەندە کەتێنەپەڕە. ئێستاش دەتوانین دیوە تێنەپەڕەکەی نموونە رێز بکەین بۆمەبەستی لێکۆڵینەوە، وەك:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| من | دە | کەوم | یان، | من | کەوتم |
| تۆ | دە | کەویت | یان، | تۆ | کەوتیت |
| ئەو | دە | کەوێت | یان، | ئەو | کەوت |
| ئێمە | دە | کەوین | یان، | ئێمە | کەوتین |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ئێوه | ده | كه‌ون | یان، | ئێوه | كه‌وتن |
| ئه‌وان | ده | كه‌ون | یان، | ئه‌وان | كه‌وتن |

ئه‌م كرداره ده‌بێت به تێپه‌ڕێنراو به [ئاندن] و ده‌گۆڕێت بۆ [كه‌واندن] و ده‌بێت به كردارێكی تێپه‌ڕ به پێی خشته‌ی جێناوه‌كان.

سه‌ره‌ڕای ئه‌م باره تێپه‌ڕه، وه‌كوو له پێشتردا باس كرا، ئه‌بینین كه [كه‌وتن] به بێ ئه‌وه‌ی بكرێت به [كه‌واندن] به‌رێگایه‌كی تر په‌نا ده‌باته‌وه بۆ جێناوه تێپه‌ڕه‌كان، وه‌ك :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| من | ده‌م | كه‌وێت | یان، | من | ده‌م | كه‌وت |
| تۆ | ده‌ت | كه‌وێت | یان، | تۆ | ده‌ت | كه‌وت |
| ئه‌و | ده‌ی | كه‌وێت | یان، | ئه‌و | ده‌ی | كه‌وت |
| ئێمه | ده‌مان | كه‌وێت | یان، | ئێمه | ده‌مان | كه‌وت |
| ئێوه | ده‌تان | كه‌وێت | یان، | ئێوه | ده‌تان | كه‌وت |
| ئه‌وان | ده‌یان | كه‌وێت | یان، | ئه‌وان | ده‌یان | كه‌وت |

له ئێره‌دا چه‌ند تێبینی‌یه‌ك هه‌یه و پێویست به دیاری كردن ده‌كات :

یه‌كه‌م : ئه‌و ستوونه جێناوه‌ی كه له‌ئه‌و رستانه‌دا به‌كار هاتوون پڕبه‌پڕ بریتی‌یه له [ستوونی بكه‌ر له رابردووی تێپه‌ڕدا].[١٥]

دووه‌م : له رانه‌بردووش دا، هه‌مان ستوون جێناو به‌كار هات. ئه‌مه‌ش ئاسایی نی‌یه له رێزمانه‌كه‌دا.

سێ‌یه‌م : ئه‌و دوازده رسته‌یه، به روخساریان دا دیاره كه له‌سه‌ر ته‌رمی

رستەیەکی سڕکراو ڕۆنراون. ئەم رستە سڕکراوەش بریتی یە لە کەسی سێیەمی تاك، وەك :

لە رانەبردوودا، (ئەو دە کەوێت)

لە رابردوودا، (ئەو دە کەوت)

چوارەم : ئەم رێژە تازەیە بە هیچ جۆرێك فەرمان پیادە ناکات چونکە گیان ناراستەوخۆیی تێدایە و لە بنەڕەتەوە بۆ کەسی سێیەم هاتووە.

پێنجەم : ئەم رێژەیە بە هیچ جۆرێك بێ پێشکار پەیدا نابێت لە یاسای هێزی پێشکاردا، چونکە جێبازی رەگ تەرخان کراوە بۆ کەسی سێیەم.

هەر بۆ سەیر با سەیری ئەم نموونەیە بکەین :

من [نە](م) [کەوت]

ئەم رستەیە، دەلوێت لە گوفتاردا کەچی دیوی [ئەرێ]، نالوێت لە گوفتاردا. بە ئەم پێیە [هەبوونی پێشکار] یەکێکە لە هەل و مەرجەکانی ئەم رێژەیە .

ئێستاش ئەگەر سەرنج لە رستە وەرچەرخاوەکان بدەین دەبینین کە جێ پێی [ئامرازی پەیوەندی نادیار] هەیە لە نێو رستەکان دا، چونکە زیندوو کردنەوەی ئەو ئامرازە نابێت بە ناتەبایی لە رێژەکەدا، بەلام بە پێچەوانەوە دەبێت بە هۆی لە خشت بردانی رستەکە، وەك :

من دەم کەوت : من پێم دەکەوت : یان، من دەکەوت پێم

ئەگەر سەیری وەرچەرخانی ئەم رستەیە بکەین لە رووی رۆنانەوە، وەك :

رستەی ئاسایی تێنەپەڕ: [شتەکە] [دە] [کەو] (ێت)

پاش هاتنی ئامراز : [شتەکە] [دە] [کەو] (ێت) [بە(من)]

یان ، [شتەکە] [بە(من)] [دە] [کەو] (ێت)

لە ئەم دوو رستەیەدا، وا دەردەکەوێت کە [شتەکە] خزابێت بۆ نێو خانەی [بەرکار] و ئەو واتای بەرکاری‌یەش پەخش بووە لە نێو رستەکەدا. وشەی [شتەکە] لە رستەی یەکەم دا بە ئاشکرا [بکەر]ە. ئەمەش لە خشت بڕدانی رستەکەیە :

بکەر بەرکار ئامراز

(---) [شتەکە] [بە من] [دە] [کەو] (ێت)

لە ئەم نموونەیەدا بە ئاشکرا جێی [بکەر] چۆڵە و [من] باز دەدات بۆ ناوی، بەڵام [بکەر] دەبێت جێناوی لکاوی هەبێت لە گوفتاردا بۆئەوەیە رستەکە وەردەچەرخێت :

(من) [شتەکە] [پێ(م)] [دە] [کەو] (ێت)

ئەمجا بە پێی جێگۆڕکێ بکەری لکاو (م) باز دەدات بۆ سەر [بەرکار] و دەبێت بە :

(من) [شتەکە] (م) [پێ(-)] [دە] [کەو] (ێت)

ئێستاش ئەگەر ئامرازی [پێ] ون بوو، دەبێت بە :

(من) [شتەکە] (م) [--] [دە] [کەو] (ێت)

پاشان ئەگەر (بەرکار) کرا بە جێناوی لکاو دەبێت بە [نادیار] بەرامبەر بە [بکەر] لە رستەی رابردوودا، ئەمجا دەگۆڕێت بۆ :

(من) [---] [---] [دە] (م) [کەو] (ێت)

ئەمەش روخساری کۆتایی رستە وەرچەرخاوەکەیە و بەڵام دەتوانین ون

بونی ئامرازەکە بە ئەم رستەیە روون بکەینەوە :

(--) [شتەکە] (-) [دە] [کەو] (ێت) [بە(من)]

(من) [شتەکە] (م) [دە] [کەو] (ێت) [پیّ(--)]

لە ئێرەدا کە [من] بوو بە بکەر بوو بە دووپارچە بەپێی رێزمانی [بکەر] لە رستەدا، ئامرازی [بە] بوو بە [پیّ] و ئەو رستەیەی کە پێك هات زۆر باوە لە گوفتاری گەرمیان دا وەك : (من شتەکەم دەکەوێت پیّ). ئەم [پیّ] یەش لە زاری سلێمانی دا سوواوە بووە بە [یّ] لە هەندیّ کرداردا، وەك :

دە (ی) گات یّ (-) : سلێمانی

یان، دە (--) گات پیّی : گەرمیانی

هەر لەبەر ئەمە رستەکە بووەبە :

(من) [شتەکە] (م) [دە] [کەو] (ێت)یّ

یان ئەگەر جێناوی (ێت) بوو . بە(یّ) وەکوو باوە لە گوفتاردا و ئەگەر دوو پیتی [یّ] ئاوێتە بوون ئەوا دەبێت بە :

(من) [شتەکە] (م) [دە] [کەو] (یّ) [16]

## ٢: ٢–وەرچەرخان و پلیکانەی کردار [17] :

ئێستاش ئەو شتانەی تا ئێستا باس کران دەتوانین بیان خەینە سەر پلیکانەی پێشکار. کرداری تیّنەپەری [کەوتن] بە ئەم چەشنە لە خشت بڕ دەدرێت لە پلیکانەکەدا :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| شتەکە | | | | | | [کەوت] |
| شتەکە | | | | | [دە] | [کەوت] |
| شتەکە | | | | [نە] | [دە] | [کەوت] |
| شتەکە | | | [بەر] | [نە] | [دە] | [کەوت] |
| شتەکە | | [بەئێمە] | [بەر] | [نە] | [دە] | [کەوت] |
| شتەکە | [٥] | [٤] | [٣] | [٢] | [١] | [٠] |

ڕێژەی وەرچەرخاوی ئەم کردارە پڕبەپڕ چەسپە لەگەڵ پلیکانەی کرداری تێپەڕدا بە ئەم چەشنە :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئێمە | | | | | [دە](مان) | [کەوت] |
| ئێمە | | | | [نە](مان) | [دە] | [کەوت] |
| ئێمە | | | | [نە] | [دە] | [کەوت] |
| ئێمە | | | [بەر](مان) | [نە] | [دە] | [کەوت] |
| ئێمە | | [پێ](مان) | [بەر] | [نە] | [دە] | [کەوت] |
| ئێمە | شتەکە(مان) | [پێ] | [بەر] | [نە] | [دە] | [کەوت] |

تەنها نا هەمواری لە ئەم پلیکانەیەدا ئەوەیە جێنی یەکەم نامێنێت چونکە ئەم ڕێژەیە بێ پێشکار نابێت. ئێستاش دەتوانین چەند نموونەیەك لە ئەو پلیکانەیە روون بکەینەوە :

(ئێمە) [شتەکە] (مان) [دە] [کەوت] (--)

یان،

یان،     (ئێمە)[شتەکە](مان)[دە][ کەو ](ێت)

(ئێمە) : بریتی‌یە لە جێگری [بکەر] کە [شتەکە] بوو :

[شتەکە] : بووە بە جێگری بەرکار

(مان) : بووە بە جێگری بکەری لکاو

نموونەیەك بۆ ئەوە بریتی‌یە لە:

(ئێمە)[دە](مان)[کەوت](ـ)

یان،     (ئێمە)[دە](مان)[کەوت](ێت)

لە ئەم رستانەدا جێگری بەرکار [شتەکە] کراوە بە جێناوی لکاو، کە نادیارە لە رستەکەدا، بۆ کەسی سێیەمی تاك لە رابردوودا. پاشان هەبوونی ئەو سێ جێگرە رابردووی تێپەڕ دەبەخشێت بە روخسار و بە رەفتار لە رستەدا. رەفتاری جێگۆڕکێ بە ئاشکرا دیارە لە نموونەکان دا بۆ کردارە وەرچەرخاوەکە بەلام رەفتاری ئەرك گۆڕکێ دەرنەکەوتووە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستی‌یەی کەوا بەرکاری لکاو لە رستەکان دا نادیارە و ئەم هۆکارەش دەبێت بە هۆی پیادە نەکردنی.

ئەمە بوو رێزمانی کرداری وەرچەرخاو کەوا بە شێوەیەکی زۆر تەم و مژدار، رستەیەکی تێنەپەڕ وەردەچەرخێنێت بۆ سەر رەفتاری رستەیەکی تێپەڕی رابردوو. لە ئەم میکانیزمەش دا خانەی [ئامرازی پەیوەندی] بزوێنەر و شێوێنەرە. بابەتی ئەم دیاردەیە بریتی‌یە لە لێکۆڵینەوەکی تێر و تەسەل ونموونەرێژ کە لەکاتی خۆیدا بڵاو دەکرێتەوە. ئەم بۆچوونانەی لە ئەم ووتارەش دا باس کراون کۆتایی رێگانین و لەوانەیە مەودای بۆ چوونی

ئێستامان (١٩٩٣) هەر ئەوەندە بێت.

لە نموونەکانی کرداری وەرچەرخاودا تەنها کرداری [کەوتن] بەکار هات بەلاّم چەند کردارێکی تر هەن کە وەرچەرخاون، وەك :[١٨]

خەو هاتن : ئێمە [خەو] (مان) [دە] [هێ](ێت)

پەرژان : ئێمە [دە] (مان) [پەرژ] (ێت)

مان : ئەوان [دە] (یان) [مێن] (ێت)

ئێشان : تۆ [دە] (ت) [ئێش](ێت)

منداڵ بوون : ئەو ژن و پیاوە [منداڵ] (یان) [نا] [بێت]

مامۆستا مەسعوود محەمەد، لە حەشارگەی ژمارە (٣) دا دەست بۆ هەموو ئەم شتانە دەبات بەلاّم هەر هیچ نادات بەدەستەوە. لە لاپەڕە (٤٩) دا دەڵێت (ئەگەر حەشارگەش نەبێت دەبێت بە مەتەڵێکی رێزمانی بڕوات)، ئێمەش لەبەشەکانی دواتر ئەم مەتەڵە شیتەڵ دەکەینەوە.

**٢ : ٣- وەرچەرخان لە [بوون و هەبوون] دا :**

ئەم وەرچەرخانەی کە بەسەر کاری ئاسایی [کەوتن]دا پیادە کرا، لە رێزمانی [بوون و هەبوون] دا دەردەکەوێت. لەبەشەکانی پاشتردا ئەوەش دەسەلمێنین کە ئەو وەرچەرخانە یەکێکە لە بنچینەکانی رێزمانی [بوون و هەبوون]و دیاردەیەکی بنەڕەتی یە بۆ رێزمانی کار لە هەموو زمانەکەدا. بەئەم پێیە ئەم میکانیزمە بە رەسەن دەگەڕێتەوە بۆ [بوون و هەبوون] نەك

بۆ [کەوتن]. بەکار هێنانی ئەم کارە تەنها بۆ روون کردنەوەی میکانیزمەکە بوو چونکە بەروخساری فیزیاوی لەبار ترە، هەرچەندە بە بیرکاری وەك یەك وان.

بوون و هەبوون لە رێزمانی نووسراودا وا ناوبراون کە [بوون] تێنەپەڕە و[هەبوون] تێپەڕە بەڵام واش نییە. بوون و هەبوون هەر دوویان تێنەپەڕن و بە میکانزمی (وەرچەرخان) دەبن بە [تێپەڕ]. ئەوەش لە یاد نەکەین کە [هەبوون] پڕ[١٩] بە پڕ بریتییە لە [هە + بوون]. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت [بوون و هەبوون] یەك رەفتاریان هەیە بەرامبەر بە دیاردەی وەرچەرخان و چی بۆ [بوون] بوترێت بۆ [هەبوون]یش دەلوێت، یان بە پێچەوانەوە. ئەمەیش ئەو میکانیزمەیە لەرووی شیتەڵکارییەوە.

لە پۆلین کردنی جێناودا بۆ کرداری زمانەکە (خشتەی ١ و ٢) باسی بوون و هەبوون نەکرا و دواخرا.[٢٠] وا لە ئێرەدا جارێکی تر دەگەڕێینەوە سەر پۆلین کردنی جێناوی لکاو. لە ئەم بەشەدا بە هیچ جۆرێك باسی بوونی [بوونایەتی] ناکەین چونکە لە رووی جێناوەوە، پڕ بە پڕ وەك کردارێکی ئاسایی زمانەکەیە. ئەم بەشە تایبەتییە بۆ (بوون وهەبوون) چونکە لە ئەم روانگەیەوە جیاوازیان هەیە لەگەڵ کردارە ئاساییەکان.

بۆمەبەستی لێکۆڵینەوە جێناوەکانی کرداری [بوون] خانە ڕێژ کران لە خشتەی ژمارە (٣)دا. ئەم خشتەیە بۆ رستەی ئاشکرا دامەزرێنراوە و بۆدیوی تێنەپەڕ لە [بوون وهەبوون]، وەك [هەم، هەیت، منم، تۆیت....]. لەئەم خشتەیەدا بە ئاشکرا دیارە کە هەموو ستوونە جێناوەکان پڕ بە پڕ لە

ستوونه جێناوەکانی کرداره ئاسایی‌یەکان دەچن تەنها بۆ کەسی سێیەمی تاك نەبێت لە رانەبردودا کە روخساری جێناوی [ێت] گۆڕاوە بۆ [ ە]. پاش بیرگوشین لە سەر ئەم جیاوازی‌یە دۆزرایەوە کە لە رستەی گومان و نیازیش دا روخساری ئەم جێناوە جیاوازە، لەسەر خشتەی (٤) دەبینین کە هەموو جێناوەکان روخساریان زۆر ئاسایی‌یە و مجورکی نیاز و گومان تەشەنە ناکات لە فیزیکیان کەچی بۆ کەسی سێیەمی تاك دیسان جیاوازی پەیدا بووەوەو بە ئەم چەشنە :

لە رانەبردوودا : سێ روخساری جیاواز دەرکەوتووە :

١- [ ە] بۆ رستەی ئاشکرا، وەك : ئازاد زیرەك [ ە]

٢- [--] بۆ رستەی نیاز، وەك : خۆزگا زیرەك با [-]

٣- [ێت] بۆ رستەی گومان، وەك : رەنگە زیرەك ب[ێت]

لە رابردوودا : دوو روخساری جیاوازی دەرکەوتووە :

١-[--] بۆرستەی نیاز و ئاشکرا، وەك :

ئازاد زیرەك بوو [--]

ئازاد زیرەك بووبا [--]

٢-[ێت] بۆرستەی گومان،وەك:

رەنگە ئازاد زیرەك بووب [ێت]

لە ئەم روخسارانەدا دەتوانین بە بەراورد لەگەڵ کرداری ئاسایی دا ئەم چەند خاڵە بنووسینەوە:

یەکەم : بۆ رستەی گومان لە رانەبردوودا، روخساری جێناوەکە پڕ بە پڕ

| جێناو | رانەبردوو | | رابردوو | | فەرمان | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار |
| من | م | - | م | - | - | - |
| تۆ | یت | - | یت | - | ـه | - |
| ئەو | ێت | - | - | - | - | - |
| ئێمە | ین | - | ین | - | - | - |
| ئێوە | ن | - | ن | - | ن | - |
| ئەوان | ن | - | ن | - | - | - |

خشتەی (١) جێناوی لکاو بۆ کرداری تێنەپەر

| جێناو | رانەبردوو | | رابردوو | | فەرمان | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار |
| من | م | م | م | م | - | م |
| تۆ | یت | ت | ت | یت | ـه | - |
| ئەو | ێت | ی | ی | - | - | ی |
| ئێمە | ین | مان | مان | ین | - | مان |
| ئێوە | ن | تان | تان | ن | ن | - |
| ئەوان | ن | یان | یان | ن | - | یان |

خشتەی (٢) جێناوی لکاو بۆ کرداری تێپەر

| جێناو | رانەبردوو | | رابردوو | | فەرمان | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار |
| من | م | - | م | - | - | - |
| تۆ | یت | - | یت | - | ە | - |
| ئەو | ە | - | - | - | - | - |
| ئێمە | ین | - | ین | - | - | - |
| ئێوە | ن | - | ن | - | ن | - |
| ئەوان | ن | - | ن | - | - | - |

خشتەی (٣) جێناوی لکاو لە (بوون و هوبوون) دا

| جێناو | رانەبردوو | | | رابردوو | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ئاشکرا | نیاز | گومان | ئاشکرا | نیاز | گومان |
| من | م | م | م | م | م | م |
| تۆ | یت | یت | یت | یت | یت | یت |
| ئەو | (ە) | -/ە | ێت | - | -/ە | ێت |
| ئێمە | ین | ین | ین | ین | ین | ین |
| ئێوە | ن | ن | ن | ن | ن | ن |
| ئەوان | ن | ن | ن | ن | ن | ن |

خشتەی (٤) جێناوی لکاو لە (بوون و هەبوون)دا، رستەی نیازو گومان

یەکسانە بە جێناوی کرداری ئاسایی، وەك :

رەنگە ئەو زیرەك بێت : رەنگە ئەو بخەوێت

رەنگە ئەو زیرەك بوو بێت : رەنگە ئەو چووبێت

دووەم : رەنگە رەگەزی [ ە] روخساری سواوی [ێت] بێت چونکە لە زۆر شوێن دا پیتی [ت] زیندوو دەکاتەوە ئەگەر بزوێن کەوتە پاشی. روخساری ئەم جێناوە زۆر ناسازە لە نووسین دا، پێویستە یەکلایی بکرێتەوە لە رووی رێنووسەوە.

سێیەم : لە زۆر ناوچەدا، لە رستەی نیازدا بزوێنی [ ە] بەکار دەهێنن ئەمەش بووە بە هۆی ئاڵۆزبوونی زمانەکە بە کەرەستەی [ایە].

چوارەم : هەموو جێناوەکانی تر (خشتەی ٣ و ٤) روخساریان بە ئاسایی دەمێنێتەوە.

لە دیوی تێپەڕی بوون و هەبوون دا تەنها ستوونی جێناوی بکەری رابردووی کرداری ئاسایی دەهێتە کایەوە، ئەویش بە هەمان روخسار بۆ هەموو کەسەکان و بۆ هەموو دەمکاتەکان و بۆ رستەی ئاشکرا و نیاز و گومان. بەڵام ئەوەی جێی جیاوازی‌یە ئەم سێ خاڵەیە :

یەکەم : ئەم رێژە تێپەڕە رێژەی فەرمان دروست ناکات چونکە خۆی لە خۆیدا رێژەیەکی وەرچەرخاوە بەسەر کەسی سێیەم دا.

دووەم : ستوونی بکەری رابردوو هەیە بەڵام ستوونی بەرکار نی‌یە.

سێیەم : ئەو جێناوانەی سەر خشتەی (٥) ناتوانن بێ چالاکی جێ گۆڕکێ بێنە سەر لێو وەك جێناوی ئاسایی، وەك :

| | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| من | هه | بوو | م | : | من، | ئه‌و | هه | ی | بوو | م |
| تو | هه | بوو | یت | : | تۆ، | من | هه | م | بوو | یت |
| ئه‌و | هه | بوو | (-) | : | ئه‌و، | تو | هه | ت | بوو | (-) |
| ئێمه | هه | بوو | ین | : | ئێمه، | تو | هه | ت | بوو | ین |
| ئێوه | هه | بوو | ن | : | ئێوه، | ئێمه | هه | مان | بوو | ن |
| ئه‌وان | هه | بوو | ن | : | ئه‌وان، | ئێمه | هه | مان | بوو | ن |

به ئاشكرا دیاره كه له نموونه‌كانی لای راست دا به‌بێ وه‌رچه‌رخان، جێناوه‌كان بكه‌رن بۆ رسته‌ی ئاسایی تێنه‌په‌ڕ به‌ڵام پاش وه‌رچه‌رخان (لای چه‌پ)، هه‌موو ئه‌و جێناوانه به هه‌مان روخسار وه‌رچه‌رخان بۆ رۆڵی [به‌ركار]. ئه‌م دیارده‌یه خۆی له خۆی نهێنیی ده‌گه‌وره‌كه‌ی ئه‌رك گۆڕكێ ده‌رده‌خات چونكه شێوه‌ی سلێمانی ئه‌م وه‌رچه‌رخانه پیاده ده‌كات به‌سه‌ر هه‌موو كه‌سه‌كان دا ئێستاش ده‌توانین ئه‌و نموونه‌ی لای چه‌پ رسته رێز بكه‌ین به‌كرداری ئاسایی تێپه‌ڕ :

من گرت (م)

یان، من هـه (م) بوو(-)

لەئێرەدا بە ئاشکرا دیارە کەوا ئەم جێناوانە جێگای بنەڕەتی‌یان نی‌یە بۆ هەڵ نیشتن، چونکە ئەگەر وترا [من هەبوو م] ئەوا دەچێتەوە بۆ سەر هەبوونی تێنەپەڕی بێ وەرچەرخان.

سەبارەت بەجێناوی لکاوی بەرکار، لەرستەی وەرچەرخاوی [بوون وهەبوون]دا گیانی بەرکار روودەکات لەکەسی سێیەمی تاك کە نادیارە، وەك:

هەبوو (-) ← من هە (م) بوو (-)

لە رستەی دووەم دا گیانی کەسی سێیەم بووە بە بەرکارێکی نادیار. واتە هەموو رێژەیەکی وەرچەرخاو گیانی کەسی سێیەمی تاك هەڵدەگرێت وەکوو بەرکار. لەئێرەدا بە ئاسانی هەست دەکرێت بەئەوەی کە بەرکارەکە بریتی‌یە لە ئەو کەسەی کە رستەی دووەم وەرچەرخاوە بە سەری دا. پاشان دەتوانین بڵێین، بۆچی وەرچەرخان هەر بە سەر کەسی سێیەمی تاك دا دەبێت، ئەدی ئەگەر کەسی سێیەمی کۆ بەکار هات، وەك :

هەبوو ن ← من هە (م) بوو ن

لە ئەم نموونەیەدا، دەردەکەوێت کە (بەرکار) کەسی سێیەمی کۆیە. ئەو رەگەزە لە رستەی یەکەم دا (بکەر)ە ولە رستەی دووەم دا بکەری [من] وەرچەرخاوە بە سەری‌دا. ئێستاش دەتوانین بەوردی رستەکان وەرچەرخێنین بە سەر هەموو کەسەکان دا، وەك:

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | من، | ئەو | هە | ی | بوو | م |
| | من، | ئەو | هەڵ | ی | گرت | م |
| یان، | تۆ، | من | هە | م | بوو | یت |
| | تۆ، | من | هەڵ | م | گرت | یت |
| یان، | ئەو، | تۆ | هە | ت | بوو | (-) |
| | ئەو، | تۆ | هەڵ | ت | گرت | (-) |
| یان، | ئێمە، | تۆ | هە | ت | بوو | (ین) |
| | ئێمە، | تۆ | هەڵ | ت | گرت | (ین) |
| یان، | ئێوە، | ئێمە | هە | مان | بوو | (ن) |
| | ئێوە، | ئێمە | هەڵ | مان | گرت | (ن) |
| یان، | ئەوان، | من | هە | م | بوو | (ن) |
| | ئەوان، | من | هەڵ | م | گرت | (ن) |

لە ئەم رستانەدا نهێنی شێوە ئاخاوتنی سلێمانی دەردەکەوێت. تەنها جیاوازیش لە ئەم بوارە دا ئەوەیە کە [بوون] بێ پارچۆڵکەی [هە] ناتوانێت دەرکەوێت،[٢١] واتە هەموو کاتێك دووپارچەیە، بەڵام کرداری ئاسایی دتوانن بو یەك پارچەیی دەربکەون. بۆ ئەوەیە ئەگەر پێشگری [هەڵ] لابرا لە ئەو رستانەدا ئەوا جێگۆڕکێ پووچەڵ دەبێتەوە ئەم روخسارانە دەر دەکەون.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| من، | ئەو | گرت | ی | (م) |
| تۆ، | من | گرت | م | (یت) |
| ئەو، | تۆ | گرت | ت | (-) |
| ئێمە، | تۆ | گرت | ت | (ین) |
| ئێوە، | ئێمە | گرت | مان | (ن) |
| ئەوان، | من | گرت | م | (ن) |

لە ئەم رستانەدا تەنها رستەی یەکەم بەپێی گوفتار لەنگە چونکە دەووترێت [ئەو گرت می] بە پێش و دواخستنی (ی) و (م). ئەم ناهەمواریە تەنها لە ئەم هەل و مەرجەدا دەر دەکەوێت :

یەکەم : تەنها ئەگەر کەسی سێیەمی تاك بکەر بوو.

دووەم : تەنها ئەگەر بەرکارەکە لکاو بوو.

سێیەم : تەنها ئەگەر بەرکارەکە کەسی سێیەمی تاك نەبێت چونکە نادیارە و شوێنی بکەری لکاو دەبێتەوە بە ئاسانی.

چوارەم : تەنها ئەگەر کردارەکە بێ پێشکار بوو واتە پێك هاتبوو تەنها لە [پلیکانەی رەگ]و کردارەکەش تێپەڕ بوو.

پاش ئەم بیر گوشینە خەست و وشکە دەتوانین جارێکی تر بیربگوشین و بنج و بنەڕەتی ئەم هەڵەیە لە قووڵایی دەریای زمانەکە دەربهێنین. ئەم کەلێنە وەك لە کرداری ئاسایی دا دەرکەوتووە دەبێت لە سەرچاوەکەوە هاتبێت. سەرچاوەکەش بریتی‌یە لە دیوی وەرچەرخاوی کرداری هەبوون. بۆنموونە ئەم کردارە لە رانەبردوودا بە ئەم چەشنەیە :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| شتەکە، | | هە | (-)یـ | ە |
| شتەکە، | من | هە | (م) | (ە) |
| شتەکە، | تو | هە | (ت) | (ە) |
| شتەکە، | ئەو | هە | (ی) | (ە) ت ی ٢٢ |
| شتەکە، | ئێمە | هە | مان | (ە) |
| شتەکە، | ئێوە | هە | تان | (ە) |
| شتەکە، | ئەوان | هە | یان | (ە) |

بە ئاشکرا دیارە کە بۆ کەسی سێیەمی تاك رستەکە لە رێچکەی [بە جێ] دەردەچێت ئەویش بە هۆی [شەڕە بزوین]ەوە. ئێستاش دەتوانین ئەو نموونەیە لە سەر باری ستوونی شیتەڵ بکەینەوە :

هە : پارچۆلکەی تایبەتی [هەبوون] بریتی‌یە لە پیتی نەبزوێن [ه] لەگەڵ پیتی بزوێن [ ە]

ی : ناو گر لە دیوی تێنەپەڕدا لو نێوان دوو بزوێن [ ە] و [ ە]

ە : بکەری لکاوی تێنەپەڕ (کەسی سێیەمی تاك)

ت : ناو گر (یان پیتی کپی دەرخراو) لە نێوان دوو بزوێن [ ە] و [ی]

ی : بکەری لکاوی، دەردکی بۆ رستەی‌وەرچەرخاوەکە کە دەرکراوە لە شوێتە رەسەنەکەی.

لە ئێرەدا ئەگەر پیتی [ه] بێ بایەخ بکەین، دەبینین کە ئەم رستە

وەرچەرخاوە، تێپەڕە و لە پێنج پیت پێك هاتووە بە ئەم چەشنە :

- سێ پیتی بزوێن [ ە]، [ ە]، [ی]

- دوو پیتی نە بزوێنی ناوگر [ی]، [ت]




بە ئەم پێیە زۆر گرانە ئەگەر زۆربکەین لە ئەم رستەیە و جێناوی (ی) دخەینەوە جێی خۆی، وەك :

هە ی (یە) یان (هەیە)

ئەم دوو رێژەیە دەچنە سەر رستەی تێنەپەڕەکەی بەروخسار و بە واتا. ئەمە هەمووی ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم جێناوە هەموو گیانی لە شووشەیە ڤایرۆسێکی پەیدا کردووە لە ئەلف و بێی زمانەوانی زمانەکەدا و ئەم ڤایرۆسە چۆتە نێو کۆمپیوتەرێ مێشکەوە و هەموومان دووبارەی دەکینەوە[٢٤] لە سەر ئەندازە، هەرچەندە شەڕە بزوێن یش لە ئارادا نەبێت. کاتێك کە بووترێت [گرتمی] هیچ پاکانەیەك نییە بۆ ئەم شوێن گۆرینە چونکە جێناوی (م) بزوێن نییە و دەبا بوترابا : [گرتیم] . (ئەم کێشە لەپاشتردا جوانتر روون دەکرێتەوە).

سەبارەت بە جیاوازی نێوان شێوە ئاخاوتنی گەرمیان و کوێستان ئەوەی کە لە سەرەوەدا باس کرا بریتییە لە شێوە ئاخاوتنی سلێمانی [کوێستان] و

تیٚ‌ی‌دا به ئاشکرا دیاره که ئه‌م شێوه ئاخاوتنه کرداری [بوون] به‌سه‌ر هه‌ر شه‌ش که‌سه‌دا وه‌رده‌چه‌رخێنێت پاشان ده‌یان چه‌سپێنێت به‌سه‌ر کرداری ئاسایی‌دا. به‌ڵام شێوه‌ی ئاخاوتنی گه‌رمیان به‌سه‌ر که‌سی سێیه‌م دا بوون وه‌رده‌چه‌رخێنێت و پاشان له رابردوودا په‌نا ده‌باته‌وه به‌ر رانه‌بردوو بۆ هه‌ڵبژاردنی به‌رکاری لکاو وه‌ك [م، ت، ی، مان، تان، یان]، به‌ڵام [ی] کپ ده‌کات چونکه کرداره‌که خۆی له خۆی دا به‌رکاری که‌سی سێیه‌م هه‌یه تێ‌ی‌دا.

## ٢ : ٤ – هه‌ڵبه‌ی چه‌سپاو :

### یه‌که‌م - پارچۆلکه‌ی [ایه] :[٢٥]

زۆر جار پارچۆلکه‌ی [ایه] ده‌چێته سه‌ر کرداری زمانه‌که له رسته‌ی نیازدا، وه‌کوو :

خۆزگا نامه‌که بنووسرایه

خۆزگا شیلان بهاتایه

بریا ئازاد نامه‌که‌ی بناردایه

ئه‌م پارچۆلکه‌یه بریتی‌یه له رێژه‌یه‌کی کرداری [بوون]و ئه‌و رێژه‌یه دووباره ده‌بێته‌وه به‌سه‌ر کرداری زمانه‌که‌دا. ئه‌م کێشه‌یه له سه‌ره‌تاوه به‌م چه‌شنه په‌یدا ده‌بێت :

کرداری بوون له رانه‌بردوودا ئه‌م سێ رێژه‌یه ده‌دات :

١- رسته‌ی ئاشکرا، وه‌ك : ئه‌و زیره‌که

٢- رستەی نیاز،      وەك : خۆزگا ئەو زیرەك با

٣- رستەی گومان،  وەك : رەنگە ئەو زیرەك بێت

پاشان ئەگەر رەگ و جێناوی کرداری [بوون] لە ئەو سێ رستەیەدا خشتە رێز بکەین (خشتەی ٦)،لە ئەم خشتەیەدا بنج سێ روخساری هەیە،[(-)، (با)، (ب)]و لە هەمان کات دا جێناوی لکاوی بکەر سێ روخساری هەیە، [(ە)، (-)، (ێت)]. بەلاّم تەنها روخساری [ێت] رەسەنە و لە سەر ئەندازەی هەموو کردارە ئاساییەکان ماوەتەوە، وەك :

رەنگە،   ئەو زیرەك   [ب]  (ێت)

رەنگە،   ئەو   [ب] [نو]  (ێت)

ئێستاش ئەگەر سەیری دوو جێناوەکەی تر بکەین دەبینین کە روخساریان شێواوە. بەلاّم ئەگەر لە ئێرەدا پێچێك بکەینەوە و بلّێین با روخساری [ ە] جێناو بێت و ئەو روخسارە بچەسپێنین بەسەر هەر سێ رستەکەدا، وەك :

ئایا   ئەو   زیرەك   [-]   (ە)

خۆزگا   ئەو   زیرەك   [با]   (یە)

رەنگە   ئەو   زیرەك   [ب]   (ە)

- رستەی یەکەم ئاساییە و ئەندازەیە بۆ رستەکانی تر.

- رستەی دووەم ناوگری وەرگرت (ی) چونکە دوو بزوێن بوون بە دراوسێ.

- رستەی سێیەم چووە سەر روخساری رستەی [فەرمان] ، وەك [تۆ زیرەك بە] جا لە بەر ئەوە روخساری خۆی پاراست، وەك [بێت].

| | رانەبردوو | | رابردوو | | فەرمان | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| جێناو | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار |
| من | م | - | م | - | - | - |
| تۆ | ت | - | ت | - | - | - |
| ئەو | ی | - | ی | - | - | - |
| ئێمە | مان | - | مان | - | - | - |
| ئێوە | تان | - | تان | - | - | - |
| ئەوان | یان | - | یان | - | - | - |

خشتەی (٥): بکەری لکاو لە (بوون و هەبوون)ی تێپەڕدا (وەرچەرخاو).

| گونجێنەر | بکەر | پاڵپشت | بنج | جێناو |
|---|---|---|---|---|
| ئایا | ئەو | زیرەك | - | (ـە) ؟ |
| خۆزگا | ئەو | زیرەك | با | (-) |
| رەنگە | ئەو | زیرەك | بـ | ێت |

خشتەی(٦): روخسارەکانی بنج لە (بوون و هەبوون) دا.

لە ئەوەدا کە باس کرا رستەی مەبەست، کە رستەی دووەمە، بە دوو

روخسار       دەردەکەوێت، وەك :

یەکەم : خۆزگا ئەو زیرەك [با] (-)

دووەم : خۆزگا ئەو زیرەك [با] (یە)

بە ئەم جەشنە بۆ چوونێکی تر پەیدا دەبێت ئەویش ئەوەیە :[٢٦]

رەنگە دەنگی [ە] پیتێکی دوو ڕوو بێت وەك پیتی [ی]و پیتی [و] کە دەتوانن

ببن بە نەبزوێن، وەك (یار، داو) یان ببن بە بزوێن وەك(شیر، دوور). ئەم

پیتەش بە ئەم جەشنە دەسازێت لە گوفتاردا :




روخساری بزوێن و دەنگە کەیشی لە [هـێی سووك] دەچێت،[٢٧] وەك بڵێین :

خۆزگا ئەو زیرەك با (ە)

خۆزگا ئەو زیرەك با (یە)

لە لایەکی ترەوە لە زمانەکەدا پیتی [ب] سواوە لە [با] دا. بۆ نموونە، ئەو

رستانەی کە لە سەرەتای ئەم بەشەدا ریزکران دەتوانن بە دوو روخسار

دەربکەون :

خۆزگا نامەکە بنووسرابایە، (یان بنووسرایە)

خۆزگا شیلان بهاتبایە، (یان بهاتایە)

خۆزگا ئازاد نامەکەی بناردبایە، (یان بناردایە)

له ئه‌م رستانه‌دا [ ه] وه‌ك بزوێن به‌كار هاتووه‌ و [ب] له‌ [با]دا سواوه‌ ئه‌مه‌ش بووه‌ به‌ هۆی ده‌ركه‌وتنی پارچۆلكه‌ی [ایه‌] له‌ رسته‌ی نیازدا بۆ ده‌مكاتی رابردوو. ئه‌م ئاخاوتنه‌ گشتی نی‌یه‌ و ناوچه‌یی‌یه‌ . له‌ هه‌ندێك ناوچه‌ی تردا جێناوی [ ه] وه‌ك نه‌بزوێن، یان وه‌ك ده‌نگی [دالی كلۆر] یان وه‌ك ده‌نگی [هێی سووك] به‌كار هاتووه‌. ئه‌مه‌ بۆ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ [با] روخسار ده‌پارێزێت و پارچۆلكه‌ی [ایه‌] له‌ ئارادا نامێنێت و ئه‌و رستانه‌ ده‌بن به‌ :

خۆزگا، نامه‌كه‌ بنووسرابا

خۆزگا، شیلان بهاتبا

خۆزگا، ئازاد نامه‌كه‌ی بناردبا

ئه‌گه‌ر ده‌ست داگرین[28] ده‌توانین چه‌ند روخسارێكی جیاواز بۆ یه‌ك رسته‌ ریز بكه‌ین، وه‌ك :

١- خۆزگا شیلان بها تایه‌

٢- خۆزگا شیلان بها تبایه‌

٣- خۆزگا شیلان بها تبا

ده‌بێت ئه‌م سێ روخساره‌ یه‌كلایی بكرێته‌وه‌ له‌ بۆ چۆنی ئێمه‌دا رسته‌ی یه‌كه‌م زۆر سواوه‌ و رسته‌ی دووه‌م رێزمانی تره‌ به‌ڵام رسته‌ی سێیه‌م له‌ ئه‌وان جوانتره‌ و جوانتر مه‌له‌ ده‌كات له‌ رووباری زمانی نووسین دا.

<u>دووه‌م - جێگای جێناوی [ی] له‌ وه‌رچه‌رخان دا</u> :

جێناوی[ی] له‌ وه‌رچه‌رخان دا جێناگۆرێت له‌ كرداری تێپه‌ڕدا، بۆ نموونه‌ :(وه‌كوو له‌پێشتردا باس كراوه‌) :

## ئەو گرتمی   یان   ئەو گرتیم

بە پێی وەرچەرخانی کردار وەك لەشێوەی سلێمانیدا دەردەکەوێت [ئەو گرتبم] راست ترە و دروست ترە کەچی لە دەمی خەڵکی دەبیسترێت [ئەو گرتمی] یان [ئەو گرتینی] یان [ ئەو گرتنی]. لە ئەم نموونانەدا [ی] دەکەوێتە پاش بەرکار بە پێچەوانەوەی ئەو پێنج جێناوەکەی تر. ئەم نا تەبایی‌یەی ئەم جێناوە دەگەڕێتەوە سەر بنج و بنەڕەتی بوون و هەبوون لە ئێسکی کاردا. کاتێك دەوترێت:

[ئازاد پارەی هەیە، یان، ئازاد هەیەتی]

بە ئاشکرا دوو پیتی [ی] شەڕ دەکەن لە سەر جێگاکەو هەردوویان پێویستن لە رستەکەدا جا لە بەر ئەوە جێناوی [ی] دەبێت بە نا تە با لە پێنج جێناوە هاوخانەکەی. لێرەش دا لە سەر ئەندازەی ئەم شەڕە بزوێنە بنجی‌یە جێناوی [ی] دەخزێت بۆ پاشتر.

**سێیەم - پارچۆلکەی [ ە] لە رابردووی تەواوی تێنەپەڕدا[٢٩] :**

لە زمانەکەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە کرداری تێپەڕ لە رابردووی بەردەوام دا پێویست بە جێناوی [ ە] دەکات، وەك :

من  نامەکەم  نووسیوە،    یان : من نووسیومە

من  دارەکەم  سووتاندووە، یان : من سووتاندوومە

لە ئەو رستانەدا لابردنی پارچۆلکەی [ ە] دەبێت بە هۆی بزرکانی زمانەکە. لە سەر ئەندازەی ئەو نموونانەی سەرەوە زۆر جار بەبێ هەست کردن ئەو پارچۆلکەیە دەنووسێنین بە رابردووی تەواوی کرداری تێنەپەڕەوە، وەك :

من   رۆیشتوومه، له جیاتی : من   رۆیشـــتووم

تۆ   کەوتوویته، له جیاتی : تۆ   کەوتوویت

بە ئاشکرا دیـاره کـەوا پارچۆلکـەی [ ه] بـووه بـه هـۆی پـەرپووت کردنـی رێزمانەکـه. بەرامبـەر بەئـەم هەڵەیـه ئەگـەر ووتـر [مـن نووسـیم یـان مـن سـووتاندووم] ئـەوا پەرپەەتی یـەکی گـەورەتر دەچەسـپێت. ئەمـە ئـەوه دەگەیەنێت کەوا پارچۆلکەی [ ه] هەر له جیٚی خۆیدا سەنگینه، واته لەگەل رابردووی تەواوی تێپەڕدا و بەس.

<u>چوارەم: وسەنی پارچۆلکەی (ه):</u>

کەرەستەی (ه) لەرەسـەن دا جێنـاو نی‌یـه وبریتی‌یـه لـەجێگری جێنـاو لـه خانـەی [-٧]دا. ئـەو رەگـەزه بریتی‌یـه لـه (مۆرفیمـی ئێسـتایی) کـه لـه رانـەبردووی (بـوون وهـەبوون) ولـەرابردووی تـەواودا دەردەکـەوێت. ئـەم راستی‌یه لـەپاش ئـەو دەرکـەوت کـه ئـەم کتێبـه نووسـرابووه وەهـەر لەبـەر ئـەوەداوای لـێ بـوردن دەکـەین کـه بـەجێناو نـاوببرێت یـان پۆلیـن بکرێـت چونکه راسـت کردنـەوەی ئەو هەڵەیه زۆر گرانه. لەلایەکی تـرەوه، رەگـەزی (ه) کـاتێك کـه دەردەکـەوێت جێناوەکـەی دەبێـت بـه (نادیـار) لەکەسـی سـێ‌یەمی تـاك دا. لەبـەر ئـەوه دەبێـت پـێ‌ی بوترێـت (جێگـری جێنـاو). لـه رووی دارشتنەوه خانەی جێنـاوی جێ‌نەگۆڕ دەکرێت به دووژێرخانه. ژێر خانەی یەکەم بۆ جێناوه وهی دووەم بۆ مۆرفیمی ئێستایی‌یه، وەك:

خانەی [-٧] ⟵ [(جێناو) (مۆرفیمی ه)] [٣٠]

# بەشی سێیەم

## میکانیزمی وەرچەرخان لە جۆرەکانی بوون و هەبوون دا

لە بەشەکانی پێشتردا ئەم بابەتانە روون کرانەوە دەربارەی ڕێزمانی بوون و هەبوون :

یەکەم : ناونانی جۆرەکان.

دووەم : دیاری کردنی دیوی تێپەڕ و تێنەپەڕ.

سێیەم : دیاری کردنی دیاردەی وەرچەرخان لە سەر ئەندازەی (کەوتن).

چوارەم : دیاری کردنی جێناوەکان لە بوون و هەبوون دا.

پاشان چەند نموونەیەك بەکارهێنرا بۆ راڤەکردنی ئەو بابەتانە. ئەو نموونانەی باس کران رەنگە بەس بن بۆ کەسانی شارەزا بەڵام لێکۆڵینەوەکە پێویست بە ئەوە دەکات ئەم بەشە تەرخان بکەین بۆ تێگەیاندنی هەمووان. جا لەبەر ئەمە رەنگە دووبارە بوونەوە رووبدات بەڵام بابەتەکە زۆر ناسك و تازەیە و دەبێت بمان بەخشن.

لە پاش ئەوەی میکانیزمی وەرچەرخان لە کرداری تێنەپەڕداو لە سەر ئەندازەی [کەوتن] پێش کەش کرا، دەست دەکەین بە شیتەڵ کردنەوەی کرداری [بوون]. ئەو میکانیزمە وەك کەرەستە بەکار دەهێنین بۆ دەرخستنی جۆرەکانی [بوون]، بە تایبەتی دیوە وەرچەرخاوەکان، کەبریتین لە سێ دیو،

وەك :

جۆری یەکەم :دیوی یەکەم، وەك: رزگار دەبێت [رزگار بوون]⁻

دیوی دووەم،وەك : رزگاری دەبێت [رزگار بوون]⁺

جۆری دووەم :دیوی یەکەم، وەك : ئەمرۆ سەرمایە [سەرما بوون]⁻

دیوی دووەم، وەك : ئەو سەرمایەتی[سەرما بوون]⁺

جۆری سێیەم : دیوی یەکەم، وەك : من هەم [هەبوون]⁻

دیوی دووەم، وەك : من هەمە [هەبوون]⁺

جۆری یەکەم کردارێکی ئاسایی تێنەپەڕە و وەردەچەرخێت بۆ تێپەڕ لەسەر ئەندازەی [کەوتن]. جۆری سێیەم بارێکی تایبەتی‌یە لە جۆری دووەم و کردارێکی تێنەپەرەو وەردەچەرخێت هەر وەك جۆری یەکەم. جۆری دووەم زۆر سەیر و پڕ نهێنی‌یە و دەبێت بە کلیلی هەندێك بابەتی داخراو لە زمانەکەدا. ئەم جۆرە ئەو سەرەتایەیە کەبیّی لێ نراوە و فەرامۆش کراوە. لە بۆ چوونی ئێستادا، رێزمانە نووسراوەکە خانوویەکە و دیوارەکانی بە [وشکە کەڵەك] دروست کراون. ئەم جۆرە رێزمانە پێویستی هەیە بە "گیراوەیەك" کە بتوانێت ببێت بە ناواخنی بەردەکانی دیواری رستە. نموونەیەکی تر لەسەر ئەم بۆ چوونە، بریتی‌یە لە کوتاڵێکی نەخشدار کە رەنگی بەرەکەی یان تەختەکەی (تەخت : Matrix :الاساس) باس نەکرا بێت. وەکوو سەرەتایەك، ئێمە دەڵێین تەختەکە لە گوڵەکە (Phases)گرنگ ترە و بەجێ‌ترە و لە پێشترە.[٣٢] کەواتە یەکەم هەنگاو دەبێت تەختی رستەکە دیاری بکەین. باشترین دەستەبەریش بریتی‌یە لە (بوون).

## ٣ : ١ – جۆری یەکەم : [بوونایەتی] :

### دیوی یەکەم : [بوونایەتی تێنەپەڕ]

لە ئەم جۆرە روخسارەی [بوون] دەست پێدەکەین چونکە روخسارێکی زۆر ئاسایی‌یە و نەشێواوە. گەردان کردنی ئەم کردارە و داڕشتنی لە رستەدا پڕبەپڕ هاوتایە لەگەڵ هەموو کردارێکی [بنجی تێنەپەڕ]. ئەم کردارە باشترین پردە بۆ گەیشتن بە ئامانجی شیتەڵ کردنەوەی هەموو جۆرەکانی [بوون]، کە بووون[٣٣] بە هۆکاری زۆربەی زۆری ئاڵۆزیی‌یەکانی زمانەکە.

لە رووی واتاوە، ئەم جۆرە لە کرداری [بوون] بە ئەم واتایانەی خوارەوە دێت :

عەرەبی : (فعل الصيروره)

فەرەنسی : Devenir[٣٤]

ئینگلیزی : to become

فارسی : شدن[٣٥]

لە ئەم کردارەدا، لە دەمکاتی رانەبردوودا، وا دەردەکەوێت کە رووداوی رووداوەکە لە داهاتوودا بێت. ئەم جۆرە واتا بەخشینە کەڵکێکی گەورەی هەیە بۆ جودا کردنەوەی واتای جۆرەکانی تری [بوون]. لە رووی هێزەوە، لە ئەوە دەچێت کە بتوانین بیکەین بە (تێپەڕ) ئەویش بە دانانی کرداری تێپەڕین [کردن] لە جێی :

[بوون] + [هێزی تێپەڕین] ← [کردن]

ئەم کردارە بە مجورکی تیپەڕین یەکسەر دەبێت بە [کردن]، وەك :

[ فێر بوون ] + [هێزی تێپەڕین] ←—— [ فێر کردن ]

[رزگار بوون] + [هێزی تێپەڕین] ←—— [رزگار کردن]

[ زەرد بوون ] + [هێزی تێپەڕین] ←—— [ زەرد کردن ]

لەئێرەدا شتێك بیر دەخەینەوە، ئەویش ئەوەیە : کاتێك کە خوێنەر ئە سێ نموونەیە دەخوێنێتەوە بیری دەڕوات بۆ چەندین نموونەی تر دەیەوێت کە دژ نموونە یان نموونەی [کوێرەك] بدۆزێتەوە ، بەڵام هە نموونەیەك لەگەڵ ئەم جۆرە [بوون] ـە ئەوڕوات لەگەڵ جۆرەکانی تر دەڕوات. ئەو پڕوپارچانەی ئەم کردارە کە بەرچاو دەکەون هەموویان، هە چەند لەیەك دەچن، بنج و بنەوانەیان لە رێزمان دا زۆر جوداوازن.

وردکردنەوەی رەگی [بوون] : کاتێك کە رەگی ئەم کارە ورد دەکەینەو ئەم پلیکانەیە دەبێت (خشت بڕ) بۆی :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| من | [رزگار] | دە | [ب] | (م) | | |
| من | [رزگار] | (دە) | [ب] | [وو] | (م) | |
| من | [رزگار] | | [ب] | [وو] | [بوو] | (م) |
| من | [رزگار] | | [ب] | [وو] | [بوو] | [با] (م) |
| | ٣+ | | ٠ | ٣- | ٤- | ٥- |

وەکوو لەم پلیکانەیەدا دیارە هەموو رێزمانێکی ئەم کردارە پربەپ یەکسانە بە هەر کردارێکی تێنەپەڕی ئاسایی. بۆ نموونە ئەم خاڵانە

خوارەوە رەچاو دەکرێن : (وەکوو لە پێشەوە باس کراوە).

یەکەم: رێژەکانی ئەم کارە ئامرازی دووپات کردنەوە (ەوە) وەردەگرن و لە کاتی پێویست یش دا وانا دەگۆڕن.

دووەم: ئەگەر رستەکە [نەرێ] بوو لە رانەبردوودا، وەك کارێکی ئاسایی رێزی ئەم هاوکێشەیە دەگرێت :

وەك : من [رزگار][نە][دە][ب](م)

من [رزگار][ نا ][ب](م)

سێیەم: ئەم کردارە [رێژەی رابردووی تەواو]ی خۆی دەدۆزێتەوە کە بە چینی سێیەم لە خشتەی رابردوو دروست دەکرێت :

من رزگار [ب][وو][بوو](م)

من رزگار [ب][وو][ و ](م)

وەك، من رزگار [بوو : وم]

لە سەر کێشی : من کەوتووم

ئەم رێژەیە لە گوفتاردا زۆر زیندووە بەلام لە زمانی نووسین دا مردووە. هۆی ئەم کورتی یەش دەگەرێتەوە بۆ کێشەی رێنووسی زمانەکە. بۆ نموونە لە گفت و گۆی دوو کەس دا ئەم رێژەیە دەردەکەوێت :

پرسیار : ئایا تۆ رزگار بوویت لە تەنیایی ؟

[رابردووی نزیك]

وەلام : کاکە من ئەوا سێ سالە رزگار (بوو:وم) لە تەنیایی.[٣٦]

## ڕابردووی تەواو[37]

ئەم جۆرە لە کرداری [بوون] باشترین بزوێنەرە بۆ پەیداکردنی هەزار
کرداری تر لە زمانەکەدا بە یارمەتی پێشگر. ئەم بزوێنەرە بە ئەم چەش
دەست دەکات بە گونجاندنی رستەی زمانەکە :

[ئاوەڵناو] + [بوون] ----← [چاوگی‌ی لێکدراوی تێنەپەڕ]

[ زەرد ] + [ بوون] ----← [زەرد بوون ]

وەکوو لە پێشتریش دا باس کرا، ئەگەر هێزی تێپەرین هات ئەوا [بو
دەبێت بە [کردن]، بە ئەم چەشنە :

[ئاوەڵناو ]+[بوون]+[هێزی تێپەڕین] ---← [چاوگی لێکدراوی تێ پەڕ]

[ زەرد]+[بوون]+[هێزی تێپەرین] ---←[زەرد کردن]

ئەم دوو چاوگە دەبن بە سەرچاوەی هەموو ڕێژەکانی دوو کردار
تێنەپەڕ و زمانەکە دەوڵەمەند دەکەن بەکردار. لەئەم دوو هاوکێشەیا
زاراوەی (ئاوەڵناو) بەکار هاتووە، ئاوەڵناوی رووت بە واتای ئاوەڵناو
دروست نەکرا و لە کردارەوە، وەك (رزگار، فێر، خۆش، سوور، بەهێ
بەرز، ئاوا، بەرەلا....). ئەو ئاوەڵناوانەی کە لە کردارەوە هاتوون وەك ناو
بکەری رابردوو (رۆیشتوو. هاتوو) وەك ناوی بەرکار (نێررا
سووتێنراو)، یان ناوی بکەری رانەبردوو (بزوێنەر، بەردشکێن)، ناتوا
لەگەڵ [بوونایەتی]دا بلوێن.

ئەم جۆرە کردارە وەکوو پێشتر باس کرا، بریتی‌یە لە یەکێك لە شێ

تێنەپەڕەکانی کاری [کردن] و دەبینین هەموو پێشگرە لکاوەکان، وەك: (هەڵ، دا، ڕا، رۆ) وەردەگرێت :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| هەڵ | بوون | : | هەڵ | کردن |
| دا | بوون | : | دا | کردن |
| ڕا | بوون | : | را | کردن |
| رۆ | بوون | : | رۆ | کردن |

وەکوو دەرکەوتووە کرداری [بوون] تەنها کرداری تێنەپەڕە لە زمانەکەدا کە بتوانێت ئەم چوار پێشگرە وەربگرێت یان پێشگری تریش وەربگرێت وەك (بەر بوون، دەربوون). ئەم پێشگرانە وەك ئاوەڵناو نین مل کەچ یش نین بۆ هێزی تێپەڕین وەك باس کرا. بۆ نموونە [بەربوون] نابێت بە [بەرکردن] کەچی دەبێت [بەردان]، [ڕابوون]یش دەبێت بە [ڕادان].

## دیوی دووەم: [بوونایەتی تێپەڕ]

ئەم جۆرە بریتی‌یە لە دیوی دووەم لە جۆری یەکەم. ئەم کردارە وەرچەرخاوە، لەرووی هێزەوە تێپەڕە. واتە وەرچەرخاوە بۆ سەر ڕەفتاری کردارێکی تێپەڕی ئاسایی لە رابردوودا، وەرچەرخانی ئەم دیوە لەئەم دوو نموونەیەدا دەر دەکەوێت، کە زۆر جار لەدەمی خەڵکەوە دەبیسترێن:

ئێمە رزگار دەبین

یان، ئێمە رزگار مان دەبێت

بە ئاشکرا دیارە کە رستەی یەکەم تێنەپەڕ و ئاسایی‌یە و رستەی دووەم وەرچەرخاوە و نائاسایی‌یە چونکە تێپەڕە و رانەبردووە و جێناوی

(مان)ی وەرگرتووە، لەسەر کێشی ئەم نموونەیە دەوترێت :

ئێمە منداڵ مان دەبێت

ئەم (رستەیە) بە هیچ جۆرێك ناتوانێت ببێت بە :

ئێمە منداڵ دەبین .

چونکە بە ئاشکرا واتاکەی پەرا...تە دەبێت.

ئەم نموونەیە دەمان گێرێتەوە سەر[٣٨] ئەو چاوگەی کە نوێنەری هە
رێژەکانی ئەم کردارەیە لە فەرهەنگ دا، ئەویش چاوگی [منداڵ بوون
ئەم کەرەستەیەدا (منداڵ) بکەرە نەوەك بەرکار، یان بە شێوەیەکی
بریتی یە لە [بکەر+چاوگی تێنەپەڕی بوون]. ئەم بکەرەی ناو چاوگ
بەرگری و داکۆشان دەکات لە رۆڵی بکەرایەتی خۆی بە تێنەپەڕیی ب
دایکی منداڵەکە خۆی بکەرە و بە تێپەڕیی. لە ژێر زەبری ئەم دوو بکە
رستەکە وەردەچەرخێت بۆ رستەیەك کە بە جێناو رابردووە و با
تێپەڕە و مۆرکی تێنەپەڕیش هەڵدەگرێت. لە بۆچوونی ئێستا دا، یەکێ
ئەو هۆکارانەی کە دەبێت بە هۆی ئەم وەرچەرخانە، بریتی یە
وەرنەگرتنی پارچۆلکەی [ێن]، واتە نەبوونی چاوگی تێپەڕێنراوی [ئا
لە رێزمانی ئەم کردارە دا.

سەبارەت بە هێزی تێپەڕین کرداری [بوون] کاتێك کە مجوو
(تێپەڕین) دەی گرت یەکسەر دەگۆڕا بە [کردن] لە دیوی یەکەم دا. بەلا
دیوی دووەم دا بە میکانیزمی وەرچەرخان ئەم کردارە دەبێت بە تێپەڕ
ئەم چەشنە :

مندالەکە [دە] [ب] [-] (ێت)

یان، مندالەکە [دە] [ب] [وو] (--)

بـە پـیـی ئـەو هـەل و مەرجـەی هەیـە تێیـان دا، هـەردوو رسـتـەکە وەردەچەرخێن و (مندالەکـە) دەکـەن بـە [بـەرکاری چـودا]. ئێستاش ئەگەر بەرکارەکـە بکـەین بـە لکـاو، دەبێـت بـە [نادیـار] بـە پـیـی هـەل و مـەرجی میکانیزمەکە. ئـەم دوو ریـزە نموونەیـەش لـە زارو گفـت و گـۆی دایکـان دا دەردەکەون :

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| من | [دە] | (م) | [ب] | (ێت): | من | [دە] | (م) | [ب] | [وو](--) |
| تۆ | [دە] | (ت) | [ب] | (ێت): | تۆ | [دە] | (ت) | [ب] | [وو](--) |
| ئەو | [دە] | (ی) | [ب] | (ێت): | ئەو | [دە] | (ی) | [ب] | [وو](--) |
| ئێمە | [دە] | (مان) | [ب] | (ێت): | ئێمە | [دە] | (مان) | [ب] | [وو](--) |
| ئێوە | [دە] | (تان) | [ب] | (ێت): | ئێوە | [دە] | (تان) | [ب] | [وو](--) |
| ئەوان | [دە] | (یان) | [ب] | (ێت): | ئەوان | [دە] | (یان) | [ب] | [وو](--) |
| (+٦) | [+١] | (-٦) | [٠] | (-٧) | [+٦] | [+١] | (-٦) | [٠] | [-٤](-٧) |

ژمارە (-٦) : جێبازی جێناوی لکاوی بکەرە لە رابردوودا (ستوونی بکەری رابردوو). ئەم ستوونە لە رانەبردوو و رابردوودا هەر یەکە، وەکوو باس کرا لە پێشتردا.

ژمارە [٠] : بنجی کرداری [بوون ی بوونایەتی].

ژمارە [-٧] : جێناوی وەستێنراوی کەسی یەکەمی تاك لەکاری تێنەپەری بوون دا (دیوی یەکەم) وەك، (مندالەکە دەبێت). ئـەم جێنـاوە مەیـەنراوە و بکەرەکەشی کراوە بە بەرکار.

ژمارە [-٤] : نیشانەی رابردووی نزیك بۆ چاوگی واوی.

ئێستاش، با میکانیزمی ئەم وەرچەرخانە دەربخەین :

رانەبردوو :

دیوی یەکەم، تێنەپەڕ :(منداڵەکە ) [x] [دە] [ب] [ێت]

دیوی دووەم، تێپەڕ : (دایکەکە ) [منداڵەکە] (ی ) [دە] [ب] (ێت)

٦+ ٥+ (٦-) ١+ ٠ ٧-[٣٩]

رابردوو :

دیوی یەکەم، تێنەپەڕ :(منداڵەکە ) [x] (x) [دە] [بوو] (-)

دیوی دووەم، تێپەڕ : (دایکەکە ) [منداڵەکە] (ی ) [دە] [بوو] (-)

لە ئەو رستانە دا، بە پێی رێزمانەکەمان، بکەری جودا، (منداڵەکە دایکەکە ) دەشێت لاببرێن لە هەر چوار نموونەکەدا. لە هەردوو رستە دووەمیش دا، بەرکارەکە (منداڵەکە ) دەشێت بکرێت بە بەرکاری لکاو ك نادیارە بۆ کەسی سێیەمی تاك لە رابردوودا، بەئەم چەشنە :

(منداڵەکە) [ x ] (x) [دە] [ ب ] (ێت)

(دایکەکە) [منداڵەکە] (ی) [دە](ی) [ ب ] (ێت)

(منداڵەکە) [ x ] (x) [دە] [بوو] (--)

(دایکەکە) [منداڵەکە] (ی) [دە](ی) [بوو] (--)

لەئێرەدا دوو رستەی وەرچەرخاو دەردەکەون، وەك (دەی بێت و دە بوو). بەلام نابێت چاوی بیر گێلە بکات لە ئاستی راستییەك، ئەویش، ل (دەی بوو) دا بە ئاشکرا (ی) بکەرە چونکە رستەکە رانەبردووە. ئە جێناوە (ی) بەرکار نییە و جێناویبکەری رابردووە وەك لە (دەی بوو) د

یان لە (دەی نارد)دا، چونکە رستەی وەرچەرخاو دەچێتە سەر رەفتاری رابردووی تێپەڕ بە جێناو. ئەندازەیەکی بن بڕ بۆ ئەم بۆ چوونە ئەوەیە کە لە رستەی (دەی خوێم و دە خوێم)دا جێناوی (ی) کە بەرکاری رانەبردووە دەتوانێت هەبێت یان نە بێت بەڵام لە (دەی بێت)دا لابردنی جێناوی (ی) دەبێت بە هۆی ئاوێتە بوونی دیوی یەکەم و دووەمی ئەم کردارە و میکانیزمەکە لەگەڕ دەکەوێت. ئەمەش چەند نموونەیەکی ترە لە شیتەڵکاری دا :

شیرین [منداڵ] (ی) [بوو] : (رابردووی نزیك)

یان:

شیرین [منداڵ] (ی) [بوو بوو] : (رابردووی دوور)

یان:

شیرین [منداڵ] (ی) [بوو:وە] : (رابردووی تەواو)

لە زۆر ناوچەدا ئەم رێژە وەرچەرخاوە. ی پێشکار دەخەنە بەر گوفتار.

وەك:

شیرین [منداڵ] (ی) بووی

یان:

شیرین [منداڵ] (ی) بوو بووی

یان:

شیرین [منداڵ] (ی) (بوو:و) یەتی

لە زۆر جێی تردا نموونەی (رزگار بوون: دیوی یەکەم)

وەردەچەرخێنن بە زۆر لێکراوی بە ئەم چەشنە:

دیوی یەکەم: من رزگار بوو بوو م

دیوی دووەم: من رزگار (م) بوو بوو(-)

ئەم رستیەی دوایی لە گفت و گۆی دایکی رزگار دەچێت کە بڵێت:

ئەو ساڵەی کە بەفر زۆرە کە باری. من رزگارم بوو بوو. ئەمە ئەو دیاردەیە یەکە [رزگار] بە زۆر لە خانەی (پێشگر)ەوە دەگوێزێتەوە بۆ خانەی (بەرکار).

لە رووی رەفتارەوە. لە هەل و مەرجی ئەرك گۆرکیٚدا ئەگەر بەرکار [نەلکاو] بوو، یان [نادیار]بوو، وەك بۆ کەسی سیٚیەمی تاك ئەوا ئەو میکانیزمە دەوەستێت بەلاٚم ئەگەر بەرکار [لکاو و کۆ]بوو ئەوا ئەرك گۆرکیٚ دێتەوەکایەوە. وەك:

شیرین [رزگار و رێبوار] (ی) [نە] [بوو بوو]

یان:

شیرین [نە] (یان) (ی) [بوو بوو] : (بەگەرمیانی)

یان:

شیرین [نە] ( - ) (ی) [بوو بوو] (ن) : بە سلێمانی

بە ئاشکرا ئەرك گۆرکیَ لە رستەی وەرچەرخاوی سیَیەم دا دەرکەوت بەپیَی هەل و مەرجی ئاسایی.

<u>دیوی دووەم و پلیکانەی کردار</u>: ئەو پلیکانەیەی کە لە دیوی یەکەم باس کرا بە تیَنەپەڕی ئەوا لە دیوی دووەم دا وەردەچەرخێت بۆ باری تیَپەڕی،

ئەگەر [شیرین] دایك بوو [رزگار]یش منداڵەکەی بوو:

شیرین [منداڵ] (ی) [دە] [ب] --- ---- --- ( ێت )

شیرین [منداڵ] (ی) [دە] [ب] [وو] --- --- (----)

شیرین [منداڵ] (ی) [×] [ب] [وو] [بوو] --- (----)

شیرین [منداڵ] (ی) [×] [ب] [وو] [بوو] [با] (----)

+٦ +٥ -٦ +١ ٠ -٣ -٤ -٥ -٧

لە ئەو پلیکانەیەدا. ئەگەر بکەری جودا (شیرین) بوو بە کۆ (شیرین و نەسرین) ئەوا بکەری لکاویش دەبێت بە (یان) بەڵام کۆتایی رستە هەر بە تێنەپەریی دەوەستێت لە هەموو بارەکان دا ئاوێتە نابێت وەك هەموو کردارێکی ئاسایی.

ئەمە بوو دیوی دووەم. لە جۆری یەکەم. لە کرداری تێنەپەر (بوونی بوونایەتی) ئەو جۆرەیان کە پڕ بە پڕ وەك کردارێکی ئاسایی زمانەکەیە، لەچەشنی [مان]. کە ئەم یش تێناپەرێنرێت بە [اندن] بەڵام وەردەچەرخێت بۆ تێپەر بە پێی پێویستی گوفتار. وەك:

ئێوە پارەتان نامێنێت.

یان، ئێوە ناتان مێنێت.

۳: ۲ – جۆری دووەم : (بوون)

## دیوی یەکەم: [بوونی تێنەپەڕ]

ئەم جۆرە روخسارەی [بوون] یەکجار زۆر بلاوە لە زمانەکەدا. هەرچەندە زۆر شێواوە و سواوە لە گوفتاردا. گەردان کردن و دارشتنی ئەم کردارە پڕ بە پڕ هاوتایە بە رابردووی تەواوی کرداری تێنەپەڕ پاش لابردنی ناوی بکەری رابردوو.

لە رووی واتاوە. ئەم جۆرە لە کرداری بوون بە ئەم واتایانەی خوارەوە هاتووە. لە زمانی تردا:

عەرەبی : دەرناکەوێت لە رانەبردوودا و لە رابردوودا دەبێت بە (کان)

فەرەنسی : etre [٤٠]

ئینگلیزی : to be [٤١]

فارسی : بودن [٤٢]

ئەم کردارە لە رانەبردوودا بێ روخسارە لە رستەدا بەڵام لە رابردوودا بە ئاشکرا دیارە. ئەم جۆرە بە شێوەی چاوگ روخساری نییە لە نووسین دا مەگەر لەگەل پالّ پشت داو بە ئەم چەشنە:

[مەردایەتی] یان [مەردێتی]

ئێستاش ئەگەر ویستمان بۆ [مەردایەتی] پلیکانەی [رەگ] رۆبنێین، ئەوا بە ئەم چەشنە دەبێت :

من [مەرد] [ x ] [--] (م)

من [مەرد] [دە ] [ب] [وو] (م)

من [مەرد] [--] [ب] [وو] [بوو] (من)

من [مەرد] [--] [ب] [وو] [بوو] [با] (م)

+٢ +١ ٠ -٣ -٤ -٥

ئالۆزترین روخساری رەگی ئەم کردارە لە رانەبردوودایە کە رەگەکە هەر روخساری نامێنێت نە لە نووسین دا و نە لە گوفتاردا و لەگەڵ ئەوەش لە خانەی پێشکاری بەردەوام یش دا [دە] نی یە. بەلاّم دیاردەی ئاوێتە بوونی ئەم خانەیە هەیە لەگەل خانەی [نەرێ] دا، وەك :

من [مامۆستا] [ئە] [بو] [--] (م)

من [مامۆستا] [ئە] [×] [--] (م)

من [مامۆستا] [ نی ] [--] (م)

٦ +٣ (١+٢) ٠ -٧

ئەم ئاوێتە بوونە زۆر جیاوازە لە جۆری یەکەم، چونکە لەوێ دا، [نە] + [دە]، یەکسان بوو بە [نا]، کەچی لە ئێرەدا (نی) دەرکەوتووە.

سەبارەت بە جێناو، ئەم کردارە جێناوی کرداری تێنەپەڕ وەردەگرێت بەلاّم لەگەڵ جیاوازیەك بۆ کەسی سێیەمی تاك کە [ێت] دەگۆرێت بۆ [ە]. ئەم دیاردەیە پڕ بە پڕ یەکسانە لەگەڵ ستوونی جێناوی رابردووی تەواو. بە واتاش واتای ئەم کردارە لە رابردووی تەواو دەچێت. ئێستاش بە چەند نموونەیەك ئەم خزمایەتی یە روون دەکەینەوە :

من خەوتوو (م) یان، من مامۆستا (م)

ئەو خەوتوو ( ە )        یان، ئەو زیرەك ( ـە )

ئەوان رۆیشتوو (ن)        یان، ئەوان ئازا (ن)

لە ئەم نموونانەدا هەمان جێناو بەکار هاتووە و هەمان واتای تەواوێتی ) هەیە لە هەردوو رستەکەدا. رێزمانی ئەم کرداره زۆر ئاڵۆز و ناسازە و بێ پێشکار و پێشگر یان بێ پاڵ پشت بەکار دەهێنرێت و شەش رستە دروست دەکات لە وەلامی پرسیاردا.

پرسیار : ئایا کێ‌یە ؟ ، یان ئایا کێن ؟

وەڵام : من (م) ، یان تۆ(یت) ، یان ئەو (ە)

ئێمە(ین) ، یان ئێوە (ن) ، یان ئەوان (ن)

ئەم رێژانە کورت ترین و رووت ترین رێژەی جۆری دووەمن. پاشان ئەگەر بیر خەست بکەینەوە لەسەر ئەو رێژانە دەتوانین هەست بەئەوە بکەین کە ئەو رێژانە لە رۆخ و چێوەی تابلۆیەك دەچن کە هێشتا نە رەنگێرابێت؛ یان لە هەیکەلی تەلارێك کە هێشتا پوختە نەکرابێت بۆ نیشتن یان، بەزمانی زانست، لە هاوکێشەیەکی ماتماتیکی رووت کراوە دەچێت وەك (١+٢=٣). ئەم رێژانە باوەشێکی بۆش و کراوەن بۆ گوفتارو بۆ سازاندنی رستە، وەك :

کێ ــــــ یە ؟        ـ من (ــــــ) م

کێ ماموستایە ؟        ـ من ( ماموستا ) م

کێ هات (ــ) ؟        ـ من ( هات ) م

کێ هاتووە ؟        ـ من (هاتوو ) م

کێ هـــەیـــە ؟ ـ من ( هـــە ) م

کێ دەڕوات ؟ ـ من ( دەرۆ ) م

لەئێرەدا بە ئاشکرا، [ناو] و [ڕێژەکانی کرداری چالاك] و پارچۆلکەی [هە] دانیشین لە باوەشە بێ خاوەکەی (بوون) دا.

## دیوی دووەم : [ بوونی تێپەڕ ]

وەك دیوی دووەم لە جۆری یەکەم، ئەم جۆرەش وەردەچەرخێت بەسەر کەسی سێیەمی تاك دا و بەئەم چەشنە :

ئەمرۆ سەرمایـە : (تێنەپەڕ )

یان بەتێ پەڕی :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| من | سەرما | ـم | ـە | |
| تۆ | سەرما | ـت | ـە | |
| ئەو | سەرما | (یـ) | ـە | تی |
| ئێمە | سەرما | مان | ـە | |
| ئێوە | سەرما | تان | ـە | |
| ئەوان | سەرما | یان | ـە | |

ئەم جۆرە رستە وەرچەرخاوانە پڕبەپڕ وەك جۆری یەکەم وەردەچەرخێن لە رووی جێناوەوە و بەئەم چەشنەش پلیکانەی کرداری تێپەڕ دروست

دەکەن

من [سەرما] (م) [ــ] (ــە)

من [سەرما] (م) [بـ] [وو] (-)

من [سەرما] (م) [بـ] [وو] [بوو] (-)

من [سەرما] (م) [بـ] [وو] [بوو] [با] (-)

+٥ -٦ ٠ -٣ -٤ -٥ -٧

وشەی سەرما هەرچەند کە بەرکار نی‌یە بەڵام وا پێ‌دەچێت کە سیمای بەرکاری وەرگرتبێت و روخساری دەچێتەوە سەر رستەی (باوکمە) وەك (ئەو باوکمە). ئەگەر ئەو نموونەیە شیتەڵ بکەینەوە دەبینین کە جیاوازی هەیە لە ئارادا، وەك :

باوکمە : [باوك + (م) ] + [ ــە]

هەرچەند ئەم رستەیە و رستەی [مامۆستایە] لە ئەم میکانیزمە دەچن بەڵام چاوی بیر نابێت گێلە بکات چونکە (م، ت، ی، مان، تان، یان) بریتین لە جێناوی تەواوکەری خاوەنێتی و (ــە) یش بریتی‌یە لە دیوی یەکەمی ئەم جۆرە بوونە، چونکە :

دەوترێت : من سەرمامە

بەس ناوترێت : من باوکمە

یان ناوترێت : تۆ سەرمامیت

بەس دەوترێت : تۆ باوکمیت

ئەم جۆرە کردارە بە شێوەیەکی گشتی بۆ هەبوونی نەخۆشی و لەگەڵ

باردۆخی لەش دا بەکاردەهێنرێت ، وەك :

من هەلآمەت ( م ) ( ـە )

ئەوان هەلآمەت (یان) ( ـە )

یان تۆ لەرز و تا ( تـ ) (بوو)

ئێمە لەرز و تا (مان) (بوو)

لە ناوچەی گەرمیان دا بە گشتی لەگەلّ وشەی (گەرەك) د بەکاردەهێنرێت. بەلاّم وشەی (گەرەك) بەرکار نی یە چونکە رستەکا دەتوانێت بەرکارێکی تر وەربگرێت.

من گەرەك (مـ) (ـە)

تۆ گەرەك (تـ) (ـە)

ئەو گەرەك (یـ) (ـە)، یان ئەو گەرەك (یـ) ـەتی

تەنیا نا هەمواری لە ئەم ودرچەرخانەدا، لە کەسی سێیەمی تاك دا دەردەکەوێت، وەك : ئەو سەرمایەتی. هۆی پەیدا بوونی ئەم روخسارە ناتەبایە دەرگەرێتەوە بۆ ئەو راستی‌یەی کە جێناوی کەسی سێیەمی تاك بزوێنە و هەموو گیانی لە شووشەیە. جێناوی (م، ت) نەبزوێنن و جێناوی (مان، تان، یان)، سەرو کلکیان نەبزوێنن. هاتنی دوو بزوێن و پێویستی بە ناوگرە، ئەو پیتە سەربارانەش لە ئەو میکانیزمەوە هاتوون. ئێستاش دەتوانین نموونەی (ئەو سەرمایەتی) شیتەلّ بکەینەوە بۆ یەکلایی کردنەوەی هەموو پیتە سەربارەکان :

[سەرما] : وشەی مەبەست لە رستەکەدا

[ یـ ] : ناوگری نێوان دوو بزوێن، [ا] و [ ـه]

[ ـه] : پارچۆلکەی کەسی سێیەمی تاك لە دیوی یەکەمی ئەم کردارەدا، پێش وەرچەرخان، وەك [سەرمایە].

[ تـ ] : ناوگری نێوان دووبزوێن، [ ـه] و [ی]. یان، (پیتی کپی زیندووکراوە).

[ ی ] : جێناوی بکەر بۆ کەسی سێیەمی تاك لە کرداری رابردووی تێپەڕدا، بە پێی هەل و مەرجی وەرچەرخان .

لە ئەو نموونەیەدا ئەگەر جێناوی [ی] خرایە شوێنی ئاسایی خۆی ئەوا رستەکە دەبێت بە [سەرمایە] و واتاکەی بەراویتە دەبێت. لەبەر ئەوە جێدەگۆڕێت و ناوگری [ی] پەیدا دەبێتەوە. کاتێك کە جێناوی [ی] بە پاشی پیتەکانەوە دەلکێت ناوگری [ت] پەیدا دەبێت لە نێوان ئەو و [ ـه] دا. لەسەر ئەم میکانیزمەش [گەرەك (یـ) ـه] دەبێت بە [گەرەك (یـ) ـەتی]، هەر چەندە (گەرەك) پێویست بە ناوگری [ی] ناکات چونکە پیتەکەی کۆتایی بزوێن نییە. بەلام ڤایرۆسەکە زۆر بەهێزە، دەیەوێت پانتاییەکی گەورەتر داگیربکات.[٤٤]

## ٣ : ٣ – جۆری سێیەم : هەبوون

### دیوی یەکەم : [هەبوونی تێنەپەڕ]

ئەم جۆرە لە کردارە [بوون] بریتییە لە جۆری دووەم بەلام لەگەڵ پێشکاری [هە] دا. ئەم کەرەستەیە لەگەڵ [بوون] دا واتای [ لە ئارادا بوون]

دەگەیەنێت. کەرستەی [هە] بە جوودایی هیچ واتایەك نا بەخشێت و بەکار ناهێنرێت لە نووسین دا بەڵام بەلکاوی لەگەڵ [بوون] جۆری سێیەم دروست دەکات و واتاکەی ئاشکرایە. پلیکانەی رەگی ئەم کردارەش لە پلیکانەی جۆری دووەم دەچێت :

من : [ × ] [هە] [بـ] [ وو] (م)

من : [ دە] [~~هە~~] [بـ] [وو] (م)

من : — [هە] [بـ] [وو] [بوو] (م)

من : — [هە] [بـ] [وو] [بوو] [با] (م)

١+ ٠ ٣- ٤- ٥- ٧-

له جێنی دووەم دا :

[~~ئە~~] [هە] [بـ] [وو] م = (رابردووی نزیك).

بەڵام :

[دە] [~~هە~~] [بـ] [وو] م = (رابردووی بەردەوام).

ئەوەی سەیرە [هە] لە ناو دەچێت ئەگەر [دە] هات لە رابردووی بەردەوام دا، وەك لە سەرەوە دەرخرا. بەڵام ئەگەر پێشکاری [نەرێ] هات ئەوا هەر ون دەبێت، وەك :

من [نە] [~~ئە~~] [~~هە~~] [بـ] [وو] (م) [٤٥]

من [نە] [~~هە~~] [بـ] [وو] (م)

من [نە] [~~هە~~] [بـ] [وو] [بوو] (م)

به کورتی [هە] ون دەبێت ئەگەر پێشگاری بەردەوامی [دە] یان پێشکاری

نەرێ [نە] هات لە رابردوودا. لە رانەبردوودا خانەی [نە] روخساری دەشێوێت بە ئاوێتە بوونێکی نە ناسراو:

من [نە] + [هە] + [ ـــ ] م = من [نی] م

لە رووی واتاوە واتای ئەم جۆرە زۆر جیاوازە لە جۆری یەکەم، یان لە دووەم :

جۆری یەکەم : من [دە] [ بـ ] (م)

جۆری دووەم : من [نە] [ ـــ ] (م)

جۆری سێیەم : من [نە] [هە][ـــ] (م)

واتای ئەو سێ رستەیە زۆر جیاوز ن لە یەکتری بە ئاشکرا. رستەی سێیەم خۆی لە خۆیدا واتاکەی، تەواوپڕ بە دەمە و بەلاّم رستەکانی تر دەتوانن چەندین وشەی تر بکەن بە پێشکار بەپێی پێویستی گوفتار.

ئەمە بوو دیوی یەکەمی جۆری سێیەم، کە بەکارهێنانی زۆر کەم و تایبەتی یە لە گوفتاردا، چونکە روخسارێکە لە روخسارەکانی جۆری دووەم. لە ئەم روخسارەدا [هە] دەبێت بە یاریدەدەری تێگەیشتن لە مەبەستی رستەکە.

لە کۆتایی ئەم بەشەدا، ئەگەر دیوی یەکەمی ئەم کردارە کەم بایەخ بێت لە گوفتاردا بەلاّم دیوە وەرچەرخاوەکەی زۆر زۆر بایەخ دارە لە زمانەکە دا و سەری گرێ کوێرەکانی زمانەکە دەدۆزێتەوە. بە بۆ چوونی ئێستایی دەبێت بە لاپەرەیەکی نوێ لە ئەلبوومی زمانەکە دا.[٤٦]

## دیوی دووەم : [هەبوونی تێپەڕ]

کرداری تێنەپەڕی [هەبوون]، کەبریتی یە لە پێشکاری [هە] + [بوون] لە جۆری دووەم، وەردەچەرخێت و دەرگایەك دەكاتەوە بۆ رێزمانی زمانەكە، ئەویش پەیدا بوونی کرداری [هەبوون] بە تێپەڕی. بۆ روون کردنەوە هەردوو دیوی ئەم کردارە لە ئەم دوو نموو نەیەدا دەردەکەون :

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| من | هە | م | یان، | من | هە | م | ـە. |
| ئێمە | هە | ین | یان، | ئێمە | هە | مان | ـە. |

بە جوانی و بەشێوەیەکی راستەوخۆ ئاشکرایە کە ئەم دیوە دوو روخساری جیاواز و دوو واتای زۆر جیاوازیان هەیە. لە ئەم میکانیزمەش دا رستەی کەسی سێیەمی تاك وەردەچەرخێت بەرەو هەموو جێناوەکانی ستوونی رابردووی تێپەڕ. بەئەم چەشنە :

دیوی یەکەمی کرداری [هە + بوون]، تێنەپەڕ :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| من | هەم | ......، | من | هە | بوو | م |
| تۆ | هەیت | ......، | تۆ | هە | بوو | یت |
| ئەو | هەیە | ......، | ئەو | هە | بوو | (-) |
| ئێمە | هەین | ......، | ئێمە | هە | بوو | ین |
| ئێوە | هەن | ......، | ئێوە | هە | بوو | ن |
| ئەوان | هەن | ......، | ئەوان | هە | بوو | ن |

له ئه‌م نموونانه‌دا، میکانیزمی وه‌رچه‌رخان ده‌که‌وێته‌گه‌ڕ له‌سه‌ر نموونه‌ی که‌سی سێیه‌می تاك، له رابردوو و رانه‌بردوودا و ده‌بێت به هۆی په‌یدا بوونی شه‌ش نموونه :

(هه‌یه) ده‌بێت به :

| | | | |
|---|---|---|---|
| من | [هه] | (م) | [ـه] |
| تۆ | [هه] | (ت) | [ـه] |
| ئه‌و | [هه] | (ی) | [ـه] (ت) (ی)[47] |
| ئێمه | [هه] | (مان) | [ـه] |
| ئێوه | [هه] | (تان) | [ـه] |
| ئه‌وان | [هه] | (یان) | [ـه] |

یان (هه‌بوو) ده‌بێت به :

| | | | |
|---|---|---|---|
| من | [هه] | (م) | [بوو] |
| تۆ | [هه] | (ت) | [بوو] |
| ئه‌و | [هه] | (ی) | [بوو] |
| ئێمه | [هه] | (مان) | [بوو] |
| ئێوه | [هه] | (تان) | [بوو] |
| ئه‌وان | [هه] | (یان) | [بوو] |

بەپێی هەل و مەرجی میکانیزمی وەرچەرخان ئەو رستانە تێ پەرێنروان لەسەر ئەندازەو تەنها روخساری ناهەموار و نموونەی ناساز بریتی‌یە لە رستەی :

ئەو هە (ی) [ـە] ←――― ئەو [هە] (ی) [ـە] (ت) (ی)

لە رستەی (ئەو هەیە) دا ناوگری (ی) پەیدا دەبێت لە نێوان دوو بزوێنەکەدا [(هە) (یـ) (ـە)]. ئەو پیتە بۆ کەسەکانی تر پەیدا نابێت چونکە هەل و مەرجی دوو بزوێن لە ئارادا نی‌یە. بەلاّم کاتێك کە رستەی (هەیە) وەردەچەرخێت جێناوەکانی (م، ت، ی، مان، تان، یان) وەردەگرێت. بۆ جێناوی (م، ت، مان، تان، یان) پێویست ناکات بە ناوگر چونکە سەروکلکیان بزوێن نی‌یە بەلاّم جێناوی (ی) بە تەنیا بزوێنە و هەموو گیانی لە شووشەیە و دەبێت بە هۆی ئەم ناسازی‌یە لەکاتی بەکار هێنان دا :

ئەو هە (ی) ـە[٤٨] " لە سەر ئاوازی " من هە (م) ـە

یان، ئەو هە (ی) بوو "لەسەر ئاوازی" من هە (م) بوو

لە نموونەی دووەم دا، (ی) و (م) جێناون بەلاّم لە نمونەی یەکە م دا ئەگەر (ی) و (م) جێناوبن ئەوا دوو رستەی هاوروخسار و دژواتا پەیدا دەبن، وەك :

ئەو هە (ی) یە : وەك دیوی یەکەمی [ هە + بوون ]

ئەو هە (ی) یە : وەك دیوی دووەمی رستەی (هەیە).

لە نموونەی یەکەم دا (ی) ناوگرە و لە نموونەی دووەم دا (ی) جێناوی

کەسی سێیەمی تاکە لەرستەی وەرچەرخاودا. لەئێرەدا دەتوانین بڵێین (ی) کە جێناوە ناتوانێت ببێت بە ناوگر وەك ئەوانی تر لەبەر هاو واتایی. هەر لەبەر ئەوەیە کە باز دەدات بۆ دواوە و یەکسەر (ی) ناوگر پەیدا دەبێتەوە لە نێوان دوو بزوێنەکەدا. بەڵام کاتێك کە جێناوی (ی) جێی گۆڕی هەمدیس هەل و مەرجی دوو بزوێن ساز دەبێتەوە ئەم جارەیان ناوگری (ت) پەیدا دەبێت و رستەکەش بەئەم چەشنە لە تەنافی رێزمان دەدرێت:

ئەو هە (ی) [ـە] (ت) (ی)

ناوگری دوو بزوێن

ڕێژەی کەسی سێیەمی تاك

ناوگرد دوو بزوێن

جێناوی کەسی سێیەمی تاك (بکەر)

لەگەڵ ئەوەش دا، چەند سەرنجێك هەیە لە ئەم نموونەیەدا، وەك:

یەکەم: پیتی ناوگر (ت) ناوگر نییە بەڵام چونکە گیانی لە شووشە نییە بۆ ناوگر دەست دەدات. بە بۆ چوونی ئێستامان رەگەزی (ـە) پیتێکی کپ هەڵ دەگرێت لە رحساردا، وەك (ـەت). ئەم پیتە کپە بە بزوێن زیندوو دەبێتەوە.

دووەم: جێناوی (ی) لە (هەیەتی) دا دەکەوێتە جێگۆڕکێ ئەگەر هەل و مەرج دروست بوو و ناوگرەکەش لە ناو دەچێت وەك:

ئازاد [ئەرك] (ی) [هە] (یـ) [ـە] (ت) (ی)

سێیەم: هەر دوو ناوگرەکە (ی) و (ت) لەناو دەچن ئەگەر هەل و مەرجی

دوو بزوێنی نەما، وەك:

**ئەگەر ، ئەو [هە] (ی) [بێت]**

سەیارەت بە بەرکار، وەکوو لە پێشتردا باس کرا، ئەم رێژەیە ستوونی بکەری رابردووی تێپەڕ وەردەگرێت لە جێی بکەری لکاو، ئەویش چی لە رابردوو و چی لە رانەبردوودا. ئەم ستوونە جێناوە بێ گومان داوای ستوونی بەرکاری رابردووی کاری تێپەڕ دەکات، ئەویش بۆ پێویستی گوفتار. ئەو ستوونەش بریتی‌یە لە (م، ت، ـــ، مان، تان، یان) ، لە زاری باوچەی گەرمیان دا. پاشان ئەو ریزە جێناوە دەکەونە بەر ئەرك گۆڕکێ وەبن بە (م، یت، ـــ، ین، ن، ن). ئەم دیاردەیە لە کرداری ئاسایی تێپەڕیش دا هەیە ئەگەر رستەکە رابردوو بوو. بەڵام ئەگەر بەرکارەکە کۆ بوو ئەوسا جێناوی لکاوی (یان) دەردەکەوێت کە بەئاشکرا لە رستەکەدا تەندار و جێدارە، وەك :[49]

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| من | [شتەکان] | (م) | [هەیە] | : | من | [هە] | (یان) | (م) | [ـە] |
| تۆ | [شتەکان] | (ت) | [هەیە] | : | تۆ | [هە] | (یان) | (ت) | [ـە] |
| ئەو | [شتەکان] | (م) | [هەیە] | : | ئەو | [هە] | (یان) | (ی) | [ـە] |
| ئێمە | [شتەکان] | (مان) | [هەبوو] | : | ئێمە | [هە] | (یان) | (مان) | [بوو] |
| ئەوان | [شتەکان] | (یان) | [هەبووبوو] | : | ئەوان | [هە] | (یان) | (یان) | [بووبوو] |
| ئێوە | [شتەکان] | (تان) | [ دەبوو ] | : | ئێوە | [هە] | (یان) | (تان) | [بوو] |

بەرکاری لکاوی (یان) لە ئەو نموونانەدا بە ئاشکرا دیارە و بەر ئەرك گۆڕکێی دەکەوێت :

ئێمە [هە] (یان) (مان) [بوو] ←

ئێمە [هە] (-) (مان) [بوو] (ن)

ئەوان [هە] (یان) (یان) [بووبوو] ←

ئەوان [هە] (-) (یان) [بووبوو] (ن)

ئێوە [هە] (یان) (تان) [ بوو] ←

ئێوە [هە] (-) (تان) [ بوو] (ن)

لەسەر ئاواز و کێشی ئەم رستانە، دیاردەی ئەرك گۆڕکێ لە رانەبردووش پیادە دەکرێت، وەك :

ئێمە [هە] (یان) (مان) [ـە] ← ئێمە [هە] (مان) [ـە] (ن)

لە ئەم رستانەدا [ـە] لە ناودەچێت و بۆ ئەوەیە کە زۆر لێ کراوی دیارە پێیانەوە. بۆچوونێکی تر هەیە ئەویش ئەوەیە کە لە جیاتی رستەی (ئەو هەیە) رستەی کەسی سێیەمی کۆ (ئەوان هەن) وەرچەرخابێت (لە بۆ چوونی ئێستادا راست ترو بەجێترە) :

وەك : نامەکان [هە] (ن) ـــ من [هە] (مـ) (ن)

ـــ تۆ [هە] (ت) (ن)

ـــ ئەو [هە] (ن) (ی)

ـــ ئێمە [هە] (مان) (ن)

ـــــ ئێوه [هه] (تان) (ن)

ـــــ ئەوان [هه] (یان) (ن)

تەنها ناسازی لە ئەو رستانەدا ئەوەیە کە رستەی [ئەو هەنی] دەبوو ببێت بە ئەو [هه] (ی) (ن) بە پێی رێزمان. ئەمە رەفتاری جێناوی بکەرە (ی)، کە لە کرداری ئاسایی زمانەکەش دا هەروا ناسازە، وەك :

من نارد (م) (ن)

کەچی دەووترێت : ئەو نارد (~~ێ~~) (ن) (ی)

لە کۆتایی ئەم بەشەدا، بە هیوا ین توانیبێتمان (میکانیزمی وەرچەرخان) بخەینە نێو ئەلبوومی رێزمانەکە. ئەو دیاردەیەی کە لەرەسەن دا لە کاری (بوون) دا دەردەکەوێت و لەپاشتردا دەفرۆشرێتەوە بە رێژەکانی رابردوو لە هەموو زمانەکەدا، وەك لە بەشەکانی تردا روونی دەکەینەوە.

ئەویش بەبیردەخەینەوە کە دیاردەیەکی ئاوها شایستەی ئەوەیە کە چەندین لێکۆڵینەوە بکرێت لەسەری. لەلایەن ئێمەوە، میکانیزمی وەرچەرخان بریتی‌یە لە یەکێك لە بنەما سەرەتایی‌یەکانی زمانەکە و لەهیچ حی‌یەك دا فەراموشی ناکەین. هەر لەبەر ئەمە لەبەشی هەشتەم دا ولە وینەی (١٣) بەجوانی روونی دەکەینەوە. ئەو بەشە تەرخان کراوە بۆ کورتەیەکی پوختە بۆ هەموو بابەتەکانی نێو ئەم نوسینە..

# بەشی چوارەم

# رستەسازی لە ڕێزمانی بوون و هەبوون دا

## ٤: ١- جۆری یەکەم : بوونی بوونایەتی

دیوی یەکەم : بوونایەتی تێنەپەڕ

کرداری بوونی (بوونایەتی) بە ئەندازەی ڕێژەی [ئەو دەبێت] لە ڕانەبردوو کردارێکی زۆر ئاساییە. لە ڕووی رستەسازییەوە [بکەر] وەردەگرێت وەکوو هەموو کردارێکی ئاسایی، (وێنەی[1]وخشتەی ٧). ئەو پێشگرانەش کە ئەم دیوە وەریان دەگرێت لە جێی تایبەتی دا ڕێزیان دەکات و دەیان خاتە بەر مەکینەی ڕێزمانەکە. خانەی [٣+] سەرەڕای پێشگری [هەڵ: هەڵ بوون، دا: دابوون، را: رابوون، رۆ: رۆبوون] دەتوانێت هەموو ئاوەڵناوەکانی زمانەکە سەوا بکات و لە ئاستی هەر ئاوەڵناوێك کردارێکی نوێ بخاتە نێو زمانەکەوە و ئەو کردارەش ڕووبەری ڕێژەکان پڕ بکاتەوە.

بۆنموونە ئاوەڵناوی [زیرەك] دەتوانێت ئەم رستانە دروست بکات:

ڕانەبردوو:

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەم | منداڵە | [زیرەك] | | [دە] | [بـ] | ێت |
| ئەم | منداڵە | [زیرەك] | [نا] | | [بـ] | (ێت) |

فەرمان:

منداڵەکە [زیرەك] [بـ] [بـ] (ــە)

منداڵەکە [زیرەك] [مە] [بـ] (ــە)

رابردووی نزیك:

ئەم منداڵە [زیرەك] [بـ] [وو] (ــ)

ئەم منداڵە [زیرەك] [نە] [بـ] [وو] (ــ)

لە ئەم نموونانەدا، دەمکاتی رانەبردوو و رابردوو دەتوانن ببن بە رستەی نیاز یان رستەی گومان:

رانەبردووی (نیاز):

با، منداڵەکە [زیرەك] [بـ] [بـ] (ێت)

با، منداڵەکە [زیرەك] [نە] [بـ] (ێت)

رانەبردووی (گومان): بەهەمان روخساربۆ هەردوو رستەکە وەکوو هەموو کرداره ئاساییەکانی زمانەکە.

رابردووی نزیك (نیاز):

با منداڵەکە [زیرەك] [بوو] [با] (ــ)

با منداڵەکە [زیرەك] [نە] [بوو] [با] (ــ)

رابردووی نزیك (گومان):

رەنگە، منداڵەکە [زیرەك] [بوو] [بـ] (ێت)

رەنگە، منداڵەکە [زیرەك] [نە] [بوو] [بـ] (ێت)

روخساری بنجی و بنەڕەتی [بوون] بە واتای [بوونایەتی] لەسەر خشتەی (٧) دەرخراوە بۆ هەموو دەمکاتەکان.

دیوی دووەم:

بوونایەتی تێپەڕ: (خشتەی٨)

لە نێو یاسای دروست بوونی روخسارە تێنەپەڕەکانی [بوون] دا، بەرکار بە بۆشی مایەوە. ئەم خانەیە لە ناخی بیردا ون نابێت و ئامادەیە بۆ بارگە هەڵ گرتن. کاتێك [بکەر] ێکی دەرەکی روو دەکات لە رستەکە ئەوا [بکەر] ی رستە تێنەپەڕەکە خانەکەی بۆ چۆڵ دەکات و خۆیشی دەترنجێتە نێو خانە بۆشەکەی [بەرکار]. بە ئەم جۆرە رستەکە وەر دەچەرخێت بۆ سەر رێبازی [رابردووی تێپەڕ] بە گوفتار و بە رێزمان:

ئەمرۆ، [منداڵەکە] [____] (-) [دە] [بـ] (ێت)

ئەمرۆ، [شیرین] [منداڵەکە] (ی) [دە] [بـ] (ێت)




یان ئەمرۆ، [____] [منداڵەکە] (ی) [دە] [بـ] (ێت)

لەئێرەدا، (منداڵەکە) لە رستەی تێنەپەڕەکەدا [بکەر] ە، کەچی بکەری

دەرەکی هات و منداڵەکەی کرد بە [جێگری بەرکار]و رستەکەی کرد بە تێپەڕ. لە ئەو دوو رستەیەدا [شیرین] بکەری جوودایە و جێناوی [ی] بکەری لکاوە. لە رستەی دووەم دا بکەری جودا لاچووە و جێیەکەی چۆڵە. ئەوەی باس کرا، پڕ بە پڕلەگەڵ رووباری زمانەکەدا دەروات بەڵام بە رێزمان، بەرکارەکەش [منداڵەکە] مل کەچە بۆ تاوتۆ کردن، وەك:

- [بەرکار] بەیەك روخسار یان[جودا] یان [لکاو] دەتوانێت هەبێت لە رستەدا، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دەتوانین [منداڵەکە] بکەین بە [بەرکاری لکاو].

وەکوو لە پێشتردا وترا، ئەم وەرچەرخانە کردار دەکات بەتێپەڕ بەڵام تێپەڕی رابردوو. هەر لەبەر ئەوەیە کە [منداڵەکە] بێ روخسار دەبێت بە جێناوی لکاو وەکوو کەسی سێیەمی تاك، لە دەمکاتی رابردوودا و لە رۆڵی بەرکاردا.

بە ئەم پێیە دەتوانین [منداڵەکە] بکەن بە بەرکاری لکاو :

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | شیرین | [ـ] | دە | (ی) | [بـ] | | (ێت) |
| | شیرین | [ـ] | نا | (ی) | [بـ] | | (ێت) |
| یان | | | دە | (ی) | [بـ] | | (ێت) |
| | | | نا | (ی) | [بـ] | | (ێت) |
| یان لە رابردوودا، | | | دە | (ی) | [بـ] | [وو] | (ـ) |
| | | | نە | (ی) | [بـ] | [وو] | (ـ) |

لەئەو رستانەدا، چی رابردوو چی رانەبردوو، بەرکاری لکاوی کەسی سێیەمی تاك بەرامبەر بە منداڵەکە هەڵگیراوە. خشتەی (٨) هەموو روخسارە وەرچەرخاوەکانی [بوونایەتی] خانە رێز دەکات بەلاّم لە سینتاکسی کرداری [بوونایەتی] دا چەند خاڵێك هەیە بۆ دیاری کردن :

١ مەرج نی‌یە هەموو بکەرێك وەربچەرخێت بۆ [بەرکار].

٢ زۆر جار چاو دەخەڵتێت ووا دەزانین کە خانەی پێشگر [ ٣١] وەردەچەرخێت کەچی واش نی‌یە : وەك

تۆ [گەرما] (ت) دەبێت

ئەم رستەیە لە رستەی [گەرما دەبێت] وەرگیراوە، لەئێرەدا وشەی (گەرما) بکەرە، بەلاّم لە رستەی [دنیا گەرم دەبێت]دا، وشەی (گەرم)بریتی‌یە لە (پێشگر). بە پێی رێزمانی ئەم کردارە وشەی [گەرم] دەبێت بە بارگەی خانەی [٣٠].

٣ بە پێچەوانەی ئەو کردارانەوە کە وەردەچەرخێن بۆ [رابردووی تێپەڕ]، کرداری [بوونایەتی] دەتوانێت روخساری بێپێشکاریش دەربخات بە رێزمان و بە گوفتار، وەك:

منداڵەکە [بـ] [وو] ( - ) :رابردووی نزیك

منداڵەکە [بـ] [وو] [بوو] ( - ) :رابردووی دوور

منداڵەکە [بـ] [وو] [و] ( ە ) :رابردووی تەواو

+٦ ٠ -٣ -٤

ئەگەر [شیرین] بوو بە بکەری دەرەکی ومنداڵەکەبوو بە بەرکاری رستەکە و پاشان کرا بە (بەرکاری لکاوی نادیار) لە ئەم بارەدا ئەوا رستەکان بە ئەم چەشنە دەگۆڕێن :

[شیرین] [منداڵەکە] [بـ] [وو] ( - ) (ی)

[شیرین] [ × ] [بـ] [وو] [بوو] ( - ) (ی)

[شیرین] [ × ] [بـ] [وو] [و] ( ە ) (ی) :(بوویەتی)

+٦ +٥ ٠ -٣ -٤

لە ئەم رستەیەی دوایی‌دا کە رابردووی تەواوە پارچۆلکەی [یەتی] پەیدا بوو، ئەمەش کێشەیەکی دەنگسازی یە و لە هەموو زمانەکەدا هەیە بە ئاوێتە بوونی بزوێنی (ـە) و بزوێنی (ی) دروست دەبن.

٤ ئەوەی‌باس کرا بریتی بوو لە چێوەی رستە لە کرداری [بوونایەتی] دا. ئێستاش دەتوانین ئەو چێوەیە بە هەردوو روخسارەکە وێنە بکێشینەوە :

دیوی یەکەم:

[بکەر][X][ئامراز][+٣][+٢][+١][٠][-١][-٢][-٣][-٤][-٥][X](-٧)[-٨]

دیوی دووەم:

[بکەر][بەرکار][-٤][+٣][+٢][+١][٠][-١][-٢][-٣][-٤][-٥](-٦)(-٧)[-٨]

| | ئاشکرا | | | نیازداری | | | گومانداری | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| **رانەبردوو** | | | | | | | | | |
| من | ده | بـ | م | بـ | بـ | م | بـ | بـ | م |
| تۆ | ده | بـ | یت | بـ | بـ | یت | بـ | بـ | یت |
| ئەو | ده | بـ | ێت | بـ | بـ | ێت | بـ | بـ | ێت |
| ئێمه | ده | بـ | ین | بـ | بـ | ین | بـ | بـ | ین |
| ئێوه | ده | بـ | ن | بـ | بـ | ن | بـ | بـ | ن |
| ئەوان | ده | بـ | ن | بـ | بـ | ن | بـ | بـ | ن |
| **رابردووی بەردەوام** | | | | | | | | | |
| من | ده | بوو | م | بـ | بوو با | م | بـ | بوو بـ | م |
| تۆ | ده | بوو | یت | بـ | بوو با | یت | بـ | بوو بـ | یت |
| ئەو | ده | بوو | - | بـ | بوو با | - | بـ | بوو بـ | ێت |
| ئێمه | ده | بوو | ین | بـ | بوو با | ین | بـ | بوو بـ | ین |
| ئێوه | ده | بوو | ن | بـ | بوو با | ن | بـ | بوو بـ | ن |
| ئەوان | ده | بوو | ن | بـ | بوو با | ن | بـ | بوو بـ | ن |
| **رابردووی نزیك** | | | | | | | | | |
| من | | بوو | م | | بوو با | م | | بوو بـ | م |
| تۆ | | بوو | یت | | بوو با | یت | | بوو بـ | یت |
| ئەو | | بوو | - | | بوو با | - | | بوو بـ | ێت |
| ئێمه | | بوو | ین | | بوو با | ین | | بوو بـ | ین |
| ئێوه | | بوو | ن | | بوو با | ن | | بوو بـ | ن |
| ئەوان | | بوو | ن | | بوو با | ن | | بوو بـ | ن |
| **رابردووی دوور** | | | | | | | | | |
| من | | بوو بوو | م | | بوو بوو با | م | | بوو بوو بـ | م |
| تۆ | | بوو بوو | یت | | بوو بوو با | یت | | بوو بوو بـ | یت |
| ئەو | | بوو بوو | - | | بوو بوو با | - | | بوو بوو بـ | ێت |
| ئێمه | | بوو بوو | ین | | بوو بوو با | ین | | بوو بوو بـ | ین |
| ئێوه | | بوو بوو | ن | | بوو بوو با | ن | | بوو بوو بـ | ن |
| ئەوان | | بوو بوو | ن | | بوو بوو با | ن | | بوو بوو بـ | ن |
| **رابردووی تەواو** | | | | | | | | | |
| من | | بوو : و | م | | بوو: و با | م | | بوو: وبـ | م |
| تۆ | | بوو : و | یت | | بوو: و با | یت | | بوو: وبـ | یت |
| ئەو | | بوو : و | ە | | بوو: و با | - | | بوو: وبـ | ێت |
| ئێمه | | بوو : و | ین | | بوو: و با | ین | | بوو: وبـ | ین |
| ئێوه | | بوو : و | ن | | بوو: و با | ن | | بوو: وبـ | ن |
| ئەوان | | بوو : و | ن | | بوو: و با | ن | | بوو: وبـ | ن |

**خشتەی (٧)**

دارِشتنی کرداری تێنەپەڕ(بوونی بوونایەتی)

| | ئاشکرا | | | نیازداری | | | گومانداری | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

## رانەبردوو

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| من | دە م | بـ | ێت | بـ م | بـ | ێت | بـ م | بـ | ێت |
| تۆ | دە ت | بـ | ێت | بـ ت | بـ | ێت | بـ ت | بـ | ێت |
| ئەو | دە ی | بـ | ێت | بـ ی | بـ | ێت | بـ ی | بـ | ێت |
| ئێمە | دە مان | بـ | ێت | بـ مان | بـ | ێت | بـ مان | بـ | ێت |
| ئێوە | دە تان | بـ | ێت | بـ تان | بـ | ێت | بـ تان | بـ | ێت |
| ئەوان | دە یان | بـ | ێت | بـ یان | بـ | ێت | بـ یان | بـ | ێت |

## رابردووی بەردەوام

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| من | دە م | بوو | - | بم | بوو با | - | م | بوو بـ | ێت |
| تۆ | دە ت | بوو | - | بت | بوو با | - | بت | بوو بـ | ێت |
| ئەو | دە ی | بوو | - | بی | بوو با | - | بی | بوو بـ | ێت |
| ئێمە | دە مان | بوو | - | بمان | بوو با | - | بمان | بوو بـ | ێت |
| ئێوە | دە تان | بوو | - | بتان | بوو با | - | بتان | بوو بـ | ێت |
| ئەوان | دە یان | بوو | - | بیان | بوو با | - | بیان | بوو بـ | ێت |

## رابردووی نزیك

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| من | ـ م | بوو | | ـ م | بوو با | - | ـ م | بوو بـ | ێت |
| تۆ | ـ ت | بوو | | ـ ت | بوو با | - | ـ ت | بوو بـ | ێت |
| ئەو | ـ ی | بوو | | ـ ی | بوو با | - | ـ ی | بوو بـ | ێت |
| ئێمە | ـ مان | بوو | | ـ مان | بوو با | - | ـ مان | بوو بـ | ێت |
| ئێوە | ـ تان | بوو | | ـ تان | بوو با | - | ـ تان | بوو بـ | ێت |
| ئەوان | ـ یان | بوو | | ـ یان | بوو با | - | ـ یان | بوو بـ | ێت |

## رابردووی دوور

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| من | ـ م | بوو بوو | | ـ م | بوو بوو با | - | ـ م | بوو بووبـ | ێت |
| تۆ | ـ ت | بوو بوو | | ـ ت | بوو بوو با | - | ـ ت | بوو بووبـ | ێت |
| ئەو | ـ ی | بوو بوو | | ـ ی | بوو بوو با | - | ـ ی | بوو بووبـ | ێت |
| ئێمە | ـ مان | بوو بوو | | ـ مان | بوو بوو با | - | ـ مان | بوو بووبـ | ێت |
| ئێوە | ـ تان | بوو بوو | | ـ تان | بوو بوو با | - | ـ تان | بوو بووبـ | ێت |
| ئەوان | ـ یان | بوو بوو | | ـ یان | بوو بوو با | - | ـ یان | بوو بووبـ | ێت |

## رابردووی تەواو

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| من | ـ م | بوو:و | ە | ـ م | بوو: و با | - | ـ م | بوو: وبـ | ێت |
| تۆ | ـ ت | بوو:و | ە | ـ ت | بوو: و با | - | ـ ت | بوو: وبـ | ێت |
| ئەو | ـ ی | بوو:و | ە | ـ ی | بوو: و با | - | ـ ی | بوو: وبـ | ێت |
| ئێمە | ـ مان | بوو:و | ە | ـ مان | بوو: و با | - | ـبان | بوو: وبـ | ێت |
| ئێوە | ـ تان | بوو:و | ە | ـ تان | بوو: و با | - | ـ تان | بوو: وبـ | ێت |
| ئەوان | ـ یان | بوو:و | ە | ـ یان | بوو: و با | - | ـ یان | بوو: وبـ | ێت |

خشتەی (٨)

دارشتنی دیوی تێپەڕ لە بونایەتی (وەرچەرخاو)

. سەبارەت بە پەل و پۆی رستە یان (ئاوەلکار و ئاوەڵگوزارە) ئەوا دەرگای لێکۆڵینەوە کراوەیە بۆ هەمووان. ئەم رستانەش وەکوو هەموو ستەی زمانەکە [ کەیایەتی : ئایا کەی؟] و [کوێیایەتی : ئایا کوێ ؟] و [چەندایەتی : ئایا چەند؟] و [چۆنایەتی : ئایا چۆن؟] پەسەند دەکەن.

٦ لە کرداری [بوونایەتی] دا رەفتارێکی سەیر دەردەکەوێت کە لە هەموو کرداری زمانەکە جوودای دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە :

کاتێك روخساری تێنەپەڕی [بوونایەتی] ئاوەڵناوی [فێر] وەردەگرێت لە خانەی [٣+] دا دەتوانێت [بەرکار] وەربگرێت هەر بە تێنەپەڕی وەك :

[ئێمە] [ئیشەکە] [فێر] [بووین]

بە ئاشکرا، [ئیشەکە] بەرکارە و رستەکە رابردووە و کردارەکەش تێنەپەڕە و جێناوەلکاوەکەش تێنەپەڕە [ین] نەك تێپەڕ [مان] و هیچ گۆڕکێیش نییە. ئەم نموونەیە یەکەم نموونەیە کە بکەوێتە بەر چاومان لە زمانەکەدا.

٧ هەموو ئەو کردارانەی کە ئاوەڵناو دەکەن بە پێشکار لە خانەی پێشگر دا دەتوانن ببن بە تێپەڕ بە کرداری [کردن] وەك [جوان بوون : جوان کردن] یان [گەرم بوون : گەرم کردن] و [فێر بوون : فێر کردن]. بەپێی خاڵی (٦) کرداری [فێرکردن] دەتوانێت دوو بەرکاری راستەوخۆ وەربگرێت وەك :

من [وانەکە] [ت] فێر دەکەم
[بەرکار]

لەئێرەدا ئەم بیروڕایە هەڵ دەوەشێتەوە چونکە [فێر] دەتوانێت ببێت بە

ێری ئیشەکە] ئەمجا ڕستەکان دەبن

ئێمە [فێری ئیشەکە] بووین

ن، من [فێری ئیشەکە] (ت) دەکەم

٦-  ٣+

بە ئاشکرا دیارە کە [فێر] پاشگرێکی کۆتایی نەهاتووە و پێویستی بە ڕگە هەیە هەر لەبەر ئەوەیە کە دەتوانین بڵێین [فێری ئیشەکە] یەك شگرە.

## : ٢- جۆری دووەم : [بوون] (وێنەی ٢):

ونی تێنەپەڕ : (خشتەی ٩) :

کاری (بوون) دەتوانێت لە ڕووی سنتاکسەوە بەبێ پاڵ پشت ڕستە وست بکات. ئەم جۆرە ڕستە یە بە [هەواڵدەری] ناوبراون وەك :

| | |
|---|---|
| من [-] م | من [بوو] م |
| تۆ [-] یت | تۆ [بوو] یت |
| ئەو [-] ە | ئەو [بوو] () |
| ئێمە [-] ین | ئێمە [بوو] ین |
| ئێوە [-] ن | ئێوە [بوو] ن |
| ئەوان [-] ن | ئەوان [بوو] ن |

هەر ئەم ڕستانە دەتوانن پاڵ پشت وەربگرن بە ئاسانی و ببن بە :

من [مامۆستا] [-] م  من [مامۆستا] [بوو] م

تۆ [مامۆستا] [-] یت تۆ [مامۆستا] [بوو] یت

له ئێرەدا هەر وشەیەك لە جێی پاڵ پشتەکە دانرا دەتوانێت پاشگری [یەتی] وەربگرێت و واتادار بێت لە زمانەکەدا، وەك [مامۆستایەتی، مەردایەتی،...]. هەر یەکێك لە ئەم وشانە لە چاوگێك دەچێت کە دایکی چەندین رێژە بێت وەك کرداری ئاسایی. لە لایەکی ترەوە وشەی پاڵ پشت واتای [اسناد] دەبەخشێت و لە هەمان کات دا هەر ئەم جۆرە پاڵ پشت وەردەگرێت. پاڵ پشتی ئەم کردارە هەموو ناوی زمانەکەیە و هەموو بڕگەیەکی ناوە، بۆ نموونە :

ئازاد [برا(م)] ـە

ئازاد [برای گەورەی من] ـە

ئازاد [مامۆستا] بووبوو

من [وا]م، تۆ [وا] مەبە

ئێمە [مامۆستا و برا گەورە ........ ی ئێوە] ین

ئەو بڕگەیەی نێو کەوانەکان بریتی‌یە لە پاڵ پشتی رستەکەو بکەری رستەکانیش ئاشکرایە. لە لایەکی ترەوە پێشکاری نەرێ لە رانەبردوودا ئاوێتە دەبێت لەگەڵ گەردیلەیەکی نادیار دا و دەبێت بە [نی] وەك :

[نە] + [؟] ⟵ [نی] لە رابردوودا

کەچی لە رابردوودا ئاوێتە نابێت :

[نە] + [دە] ⟵ [نە] + [دە] : رابردووی بەردەوام

[نه]+ [ ـ] ــــــ [نه] : رابردووی نزیك ، دوور، تەواو

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە روخسار گۆرینی [نە] بۆ [نی] لە رابردوودا ب
هۆکار نی یە و دەبێت گەردیلەیەکی نادیار لە خانەی بەردەوامی دا هەبێ
ئەگەر نا ئەی بۆچی لە رابردوودا نەبوو بە [نی].

بوونی تێپەر : خشتەی (١٠) :

سەبارەت بە وەرچەرخان، بوونی [پاڵ پشتایەتی] بە هیچ جۆرێ
وەرناچەرخێت بەڵام [بوونی هەواڵدەری] لە چەند بارێك دا وەر دەچەرخێ
و دەتوانێت گەردان کردنی تێپەریش پەسەند بکات، بۆ نموونە :

رستەی هەواڵ (سەرما [ ـ ] یە) دەبێت بە ئەم رێزانەدا لە وەرچەرخان دا:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| من | [سەرما] | (م) | [ە] | | |
| تۆ | [سەرما] | (ت) | [ە] | | |
| ئەو | [سەرما] | (ی) | [ە] | ت | (ی) |
| ئێمە | [سەرما] | (مان) | [ە] | | |
| ئێوە | [سەرما] | (تان) | [ە] | | |
| ئەوان | [سەرما] | (یان) | [ە] | | |

بە ئاشکرا بکەرەکە [سەرما] وەرچەرخاو بوو بە [بەرکار] و رستەکە
هاتە سەر رێبازی رابردووی تێپەر بە رێزمان. لەئێرەدا ئەگەر پێشکار
[سەرما] لابرا ئەوا رستەکان دەبن بە :

مـن [ ـــ ] مه

تـۆ [ ـــ ] تە

ئـەو [ ـــ ] یەتی

ئێمە [ ـــ ] مانە

ئێوە [ ـــ ] تانە

ئەوان [ ـــ ] یانە

ئەم ڕێژانە ڕەبەڕ بریتین لە ڕێژەی ڕابردووی تەواو بۆ کرداری تێپەڕ وەك [ناردوومە، ناردووتە، ناردوویەتی، ناردوومانە، ناردووتانە، ناردوویانە].

سەبارەت بە جێگۆڕکێی، (بوون) لە دیوی تێنەپەڕدا بێ کێشەیە بەڵام کاتێك کە وەرچەرخا بۆ سەر دیوی تێپەڕی ڕابردوو جێگۆڕکێ دەست پێ دەکات، وەك:

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | دە | م | بوو |
| | | | م | نە | | دە | | بوو |
| | م | پێ | | نە | | دە | | بوو |
| سەرما | م | پێ | | نە | | دە | | بوو |
| +٥ | -٦ | +٤ | | +٢ | | +١ | | |

ئەم جێ گۆڕکێ یە لە ڕانەبردوو و ڕابردوودا پیادە دەکرێت چونکە کردارەکە وەرچەرخاوەبۆسەر ڕێبازی ڕابردووی تێ پەڕ، وەك : [٥١]

من نی مه

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | بـ | | | وو | | | - | م |
| | | | | | دە | بـ | | | وو | | | - | م |
| | | | | نە | دە | بـ | | | وو | | | - | م |
| | | | پاڵ | نە | دە | بـ | | | وو | | | - | م |
| | | ئامراز | پاڵ | نە | دە | بـ | | | وو | | | - | م |
| بکەر | - | ئامراز | پاڵ | نە | دە | بـ | | | وو | | | - | م |
| | | | | | - | - | | | | | | - | م |
| | | | | | - | - | - | | | | | - | - |
| | | | | | - | - | - | - | | | | - | - |
| | | | | | (دە) | بـ | - | - | وو | | | - | م |
| | | | | | | بـ | - | - | وو | بوو | | - | م |
| | | | | | | بـ | - | - | وو | بوو | ها | - | م |
| بکەر | - | ئامراز | پاڵ | نە | (دە) | بنج | - | - | 3- | 4- | 5- | (-٦) | (-٧) |

وێنەی (٢)

پلیکانە وچنیوەی رستە لە (بوون)دا.

تێبینی: پاڵ = پاڵپشت

| | ئاشکرا | | | نیازداری | | | گومانداری | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| **رانەبردوو** | | | | | | | | | |
| من | | - | م | | با | م | | بـ | م |
| تۆ | | - | یت | | با | یت | | بـ | یت |
| ئەو | | - | ە | | با | - | | بـ | ێت |
| ئێمە | | - | ین | | با | ین | | بـ | ین |
| ئێوە | | - | ن | | با | ن | | بـ | ن |
| ئەوان | | - | ن | | با | ن | | بـ | ن |
| **رابردووی بەردەوام** | | | | | | | | | |
| من | دە | بوو | م | بـ | بوو با | م | بـ | بوو بـ | م |
| تۆ | دە | بوو | یت | بـ | بوو با | یت | بـ | بوو بـ | یت |
| ئەو | دە | بوو | - | بـ | بوو با | - | بـ | بوو بـ | ێت |
| ئێمە | دە | بوو | ین | بـ | بوو با | ین | بـ | بوو بـ | ین |
| ئێوە | دە | بوو | ن | بـ | بوو با | ن | بـ | بوو بـ | ن |
| ئەوان | دە | بوو | ن | بـ | بوو با | ن | بـ | بوو بـ | ن |
| **رابردووی نزیك** | | | | | | | | | |
| من | | بوو | م | | بوو با | م | | بوو بـ | م |
| تۆ | | بوو | یت | | بوو با | یت | | بوو بـ | یت |
| ئەو | | بوو | - | | بوو با | - | | بوو بـ | ێت |
| ئێمە | | بوو | ین | | بوو با | ین | | بوو بـ | ین |
| ئێوە | | بوو | ن | | بوو با | ن | | بوو بـ | ن |
| ئەوان | | بوو | ن | | بوو با | ن | | بوو بـ | ن |
| **رابردووی دوور** | | | | | | | | | |
| من | | بوو بوو | م | | بوو بوو با | م | | بوو بوو بـ | م |
| تۆ | | بوو بوو | یت | | بوو بوو با | یت | | بوو بوو بـ | یت |
| ئەو | | بوو بوو | - | | بوو بوو با | - | | بوو بوو بـ | ێت |
| ئێمە | | بوو بوو | ین | | بوو بوو با | ین | | بوو بوو بـ | ین |
| ئێوە | | بوو بوو | ن | | بوو بوو با | ن | | بوو بوو بـ | ن |
| ئەوان | | بوو بوو | ن | | بوو بوو با | ن | | بوو بوو بـ | ن |
| **رابردووی تەواو** | | | | | | | | | |
| من | | بوو : و | م | | بوو: و با | م | | بوو: وبـ | م |
| تۆ | | بوو : و | یت | | بوو: و با | یت | | بوو: وبـ | یت |
| ئەو | | بوو : و | ە | | بوو: و با | - | | بوو: وبـ | ێت |
| ئێمە | | بوو : و | ین | | بوو: و با | ین | | بوو: وبـ | ین |
| ئێوە | | بوو : و | ن | | بوو: و با | ن | | بوو: وبـ | ن |
| ئەوان | | بوو : و | ن | | بوو: و با | ن | | بوو: وبـ | ن |

**خشتەی (٩)**

دارشتنی کرداری تێنەپەڕ(بوون)

يازدەيەم : ديارەدەى [ياريدەدان] و ديارەدەى [وەرچەرخان] لە رانەبردوودا دروست نەبن كەچى لە رابردوودا بلاّو دەبنەوە. ئەمە ئەوە دەگەيەنێت كە رێژەى رانەبردوو هەموو ديارەدە بنەڕەتىيەكان جێ دەكاتەوە.

دوازدەيەم : رێژەى بنەڕەت دەتوانێت گيرفانێك بكاتەوە بۆ رێژەكانى فەرمان، بۆ بكەر [ـە، ن] وەردەگرێت و بۆ بەركار [م، ت، ى، مان، تان، يان]. لێرەش دا لەبەر ئەوەى فەرمان بەشێكە لە رێژەى بنەڕەت، تێپەڕ و تێنەپەڕ هەر يەكن و رەفتار و ئەركى جێناويش هەر بنەڕەتىيەو وەرچەرخان و ياريدەدان نىيە، وەك :

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| بـ | (م) | گره | يان، | بـ | (م) خەوێنە |
| بـ | (ى) | گره | يان، | بـ | (ى) خەوێنە |
| بـ | (مان) | گره | يان، | بـ | (مان) خەوێنە |
| بـ | (يان) | گره | يان، | بـ | (يان) خەوێنە |

لە رێژەى فەرمان و رانەبردوودا هەر هەمان ستوونى جێناو بەكار هات بۆ [بەركار]، هەر چەندە جێناوى (ت، تان) دەرنەكەوت ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ رێزمانى رێژەى فەرمان.

## ٧: ٢ – تايبەتمەندى [بوون] :

ئەوەى لە پێشتردا باس كرا بەسەر هەموو كارە ئاساييەكان دا دەچەسپێت. واتە هەموو كارى زمانەكە بەلايەك و كارى [بوون و هەبوون] بەلايەك. ئێستاش دەبينين كە تەنها كارى [بوون] لە رانەبردوودا سێ

روخساری هەیە بۆ رەگ و سێ روخساری هەیە جێناوی کەسی‌ی سێیەمی تاك وەك :

ئەو [ــ] (ە)، ئەو [با] (-)، ئەو [بـ] (ێت)

یان ئەو [هە-] (یە)، ئەو [هەبا] (-)، ئەو [هەبـ] (ێت)

ئەم دوو نموونەیە هەر دوویان تێنەپەڕن بەڵام وەردەچەرخێن بۆ تێپەڕ بەئەم چەشنە:

من [هە] (م) (-) (ە)، من [هە] (م) [با] (-)، من [هە] (م) [بـ] (ێت)

بە ئاشکرا دیارە کە ئەم کارە سێ روخساری هەیە بۆ رستەی ئاشکرا و رستەی نیاز و رستەی گومان. لە هەمان کات دا بۆ کەسی سێیەمی تاك جێناوەکە سێ روخساری هەیە. لەگەڵ ئەویش دا کاری بوون و کاری هەبوون بە شێوەیەکی زۆر سەیر وەردەچەرخێن بەرەو تێپەڕ و ریزێك جێناو دەکەن بە بکەر کە بریتی‌یە لە ستوونی بکەر لە رابردوودا، وەك:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| رەنگە | من | [هە] | (م) | [بـ] | (ێت) |
| رەنگە | تۆ | [هە] | (ت) | [بـ] | (ێت) |
| رەنگە | ئەو | [هە] | (ی) | [بـ] | (ێت) |
| رەنگە | ئێمە | [هە] | (مان) | [بـ] | (ێت) |
| رەنگە | ئێوە | [هە] | (تان) | [بـ] | (ێت) |
| رەنگە | ئەوان | [هە] | (یان) | [بـ] | (ێت) |

لە تێکرای ئەوەدا کە باس کرا ئەم بەرەنجامانە هاتنە کایەوە:

یەکەم: لە ڕانەبردوودا هەموو کارە ئاسایییەکان یەک ڕوخسارو ویەک ڕەفتار بۆ جێناو دەنوێنن.

دووەم: تێپەڕ و تێنەپەڕ هەر هەمان ستوون جێناو وەردەگرن، لە ڕانەبردوودا.

سێیەم: شێوازی ڕستە لە مەبەستی گومان و نیاز، هیچ ناگۆڕێت نە لە جێناو نە لە ڕوخساری ڕەگی کارەکە.

چوارەم: هەموو کارە تێپەڕەکان دەتوانن ستوونە جێناوی [م، ت، ی، مان، تان، یان]، وەربگرن بۆ [بەرکاری لکاو]. لە هەمان کات دا، دەتوانن ئەو ستوونە جێناوە فەرامۆش بکەن لەڕابردوودا.

پێنجەم: ئەوەی وترا لە سەر ڕانەبردوو بەسەر ڕێژەی فەرمانیش دا دەچەسپێت بە پێی ڕێزمانەکەی.

شەشەم: تەنها کرداری [بوون] بە ڕوخساری [بوون] یان [هەبوون] بە تێنەپەڕی دەتوانێت سێجۆر [بنج] لە ڕانەبردوودا دەربخات بۆ هەموو کەسەکان و سێ ڕوخساری جێناو دەربخات بۆ کەسی سێیەمی تاک.

حەوتەم: ئەوەی لە خاڵی پێشوودا باس کرا دەتوانێت وەربچەرخێت بۆ تێپەڕ لە شێوازی [ئاشکرا و نیاز و گومان]دا.

هەشتەم: کاتێك کە [بوون] وەرچەرخا ریزێك جێناو دەخوازێت بۆ بکەر کە پڕ بە پڕ ریزە جێناوەکەی بەرکارە بۆ کردارە ئاسایییەکان. ئەو ریزە جێناوە بریتییە لە [م، ت، ی، مان، تان، یان] بۆ بکەر، بۆ بەرکاریش [م، یت، -، ین، ن، ن].

دووەم: لە زۆر ناوچەدا بۆ رستەی نیازداری دەوترێت [ئەو بایە، یان ئەو هەبایە] لە جێی [ئەو با، یان ئەو هەبا]. لەئێرەدا جێناوی دەرکەوتوو [ـە] دەبێت بە سەرچاوەی ئاڵۆزی لە رێژەکانی رابردوودا.

## ٧: ٣– رەفتاری جێ گۆڕکێ:

**یەکەم: جێ گۆڕکێ لە بنەڕەت دا:**

وەکوو لە پێشتردا باس کرا، کارە ئاسایی‌یەکان دوو ریز جێناوی لکاو وەردەگرن لە رێژەی بنەڕەت دا. ریزێك بۆ بکەر [م، ت، ێت، ین، ن، ن] کە جێ نەگۆڕن و هەر دەم پشتی رەگ بەرنادەن و ریزێك بۆ بەرکار [م، ت، ی، مان، تان، یان] کە جێ گۆڕن هەردەم پلیکانەی پێشکار دەکەن بە جێباز و هەموو کاتێك جێ‌گیرن بەیەکەم خانەوە. لەئێرەدا کەوترا [رێژەی بنەڕەت] بێ‌گومان دەبێت بە جێناوەکەشی بوترێت [جێناوی بنەڕت] و لە هەمان کات دا دەبێت بە رەفتاری جێناوەکەش بوترێت [رەفتاری بنەڕەت]. ئەم بۆ چوونە زانستیانەیە بە تەواوی راستە لە زمانەکەدا، چونکە ئەو دوو ریزە جێناوە ئەو دوو رەفتارە بنەڕەتی‌یە دەپارێزن. ئەو جێناوەی کە جێ گۆڕە لە پاش وەرچەرخانیش هەر جێ گۆڕە ئەوەی جێ‌نەگۆڕە هەر جێ نەگۆڕە واتە ئەرکی جێناوەکە گرنگ نی‌یە بەڵام رەفتاری بنەڕەتی پۆلە جێناوەکە گرنگە.

دووەم: جێ گۆڕکێ لە یەکەم هەنگاودا:

لە ئەوەدا کە باس کرا ئەوە دیاری کرا کە رەفتاری جێ گۆڕکێ لە نەرێتەوە هاتووە و ئەو رەفتارە هەرچەند رەفتاری بەرکارە بەلاّم شەپۆلی دەروات لە یەکەم هەنگاودا بەرەو [بوون و هەبوون] بەلاّم بە وەرچەرخاوی و بە [ئەرك گۆڕکێ]. وەك:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| رەنگە | من | هە | م | ب | ێت |
| رەنگە | تۆ | هە | ت | ب | ێت |
| رەنگە | ئەو | هە | ی | ب | ێت |
| رەنگە | ئێمە | هە | مان | ب | ێت |
| رەنگە | ئێوە | هە | تان | ب | ێت |
| رەنگە | ئەوان | هە | یان | ب | ێت |

ئەوەی شایانی باسە ئەو رستانە بریتین لە دیوی وەرچەرخاو بۆ رستەیەکی ئاسایی، وەك [رەنگە هە بێت]. بەلاّم ئەو جێناوانە بە وەرچەرخاوی ئەرکی [بکەر] دەبینن و رەفتاری جێگۆڕکێ هەر دەپارێزن. ئەوەش دەبێت دیاری بکرێت کە وەستاندنی هەر هەنگاوێکی جێ گۆڕکێ دەست بە هۆی بزرکاندنی زمانەکە.

سێیەم: رەفتاری جێ گۆڕکێ لە دووەم هەنگاودا:

وەکوو لە بەشەکانی پێشتردا باس کرا رێژەی رابردوو رێژەیەکی رۆنراوە لە ناریدەی رێژەکانی بوون. لە خاڵی پێشتردا وترا کە رەفتاری جێ گۆڕکێ لە یەکەم هەنگاودا لە رێژەکانی رانەبردووی [بوون و هەبوون]دا

دەردەکەوێت بەڵام بە [وەرچەخاوی]. ئەم [جێ گۆڕکێ]و ئەم [ئەرك

گۆڕکێ]یە دەچێتە نێو هەموو رێژەیەکی رۆنراوەوە بە بوونی یاریدە.

لەبەر ئەوە ، لە دووەم هەنگاودا دیاردەی جێگۆڕکێ دەکرێت بە دیاری ا

دەبەخشرێت بە رێژەکانی رابردوو. بەکورتی، رەفتاری جێگۆڕکێ بریتییە

لە رەفتاری ریزە جێناوی [م، ت، ی، مان، تان، یان]، ئەگەر هەبن لە رستەدا

بەم چەشنە:

<u>یەکەم: لە رانەبردوودا:</u> (رێژەی بنەڕەت)

١- لە کارە ئاساییەکان لە رۆڵی [بەرکار]دا

٢- لە کاری [بوون و هەبوون]ی وەرچەرخاودا لە رۆڵی [بکەر]دا

<u>دووەم:لە رابردوودا :</u> (رێژەی رۆنراو).

بۆ هەموو کاری زمانەکە بە وەرچەرخاوی لە رۆڵی [بکەر]دا

<u>سێیەم : لە رێژەی فەرمان دا:</u>

لە کارە ئاساییەکان دا، لە رۆڵی [بەرکار]دا، وەك رێژەی

رانەبردوو.

ئەمەبوو رەفتاری جێ گۆڕکێ لە [رێژەی بنەڕەت]دا و لە [دیاردەی

وەرچەرخان] و لە [دیاردەی یاریدەدان]دا. ئەوەش لە یاد نەکەین کە جێناو

جێ گۆڕ لە چەشنی [م، ت، ی، مان، تان، یان]، بریتییە لە سێ پرینگێکی

ترازاو بەبێ کەرەستەیەکی سەربار و دەرەکی هەرگیز روخساری تەواو

خۆی نابەخشێت و ناوەستێت لەبەرچاو.

## ٧: ٤- جێگۆڕکێ لە رابردوودا:

وەکوو لەئەم نووسینەدا وترا رێژەی رابردوو ئاوێتەیە لە دوو کردار، بەئەم شێوەیە :

-یەکەمیان بریتی‌یە لەکارەکە خۆی

-دووەمیان بریتی‌یە لە رێژەی (بوون).

لە پێشتردا باسی ئەوە کرا کە [هەبوون] دوو پارچەیە بەلاّم رەگی رابردووی کارە ئاسایی‌یە سادەکان یەك پارچەیە جا لەبەر ئەوە جێ گۆرکێ دەوەستێت.

ئێمە گرت [-] (-) (مان)

ئێمە گرت [با] (-) (مان)

ئێمە گرت [بـ] (ێت) (مان)

لەئێرەدا وەکوو لە پلیکانەی کاردا باسی کرا [گرت] و [رێژەکانی بوون یەك پارچەن و لەت ناکرێن. جا لەبەر ئەوە ناوترێت :

گرت (مان) [-] (-)

گرت (مان) [با] (-)

گرت (مان) [بـ] (ێت)

هەرچەندە ئەم رێژانەش بە هەڵە دەوترین، وەکوو [گرتمانە، گرتمانبایە گرتمانبێت] لە سەر ئەندازەی [هەمانە، هەمانبایە، هەمانبێت]. لەلایەکی

ترەوە رەگی رابردووی یەك پارچەیی هەر ئەو روخسارە نی یە بۆ [تێپەر]

چەند روخساری تریش هەیە کە یەك پارچەن، وەك:

سووتاند [-] (-) (مان)

سووتاند [با] (-) (مان)

سووتاند [بـ] (ێت) (مان)

یان،

گرتبوو [-] (-) (مان)

گرتبوو [با] (-) (مان)

گرتبوو [بـ] (ێت) (مان)

یان،

سووتاندبوو [-] (-) (مان)

سووتاندبوو [با] (-) (مان)

سووتاندبوو [بـ] (ێت) (مان)

لەئێرەدا، رابردووی بەردەوام بەر ئەم یەك پارچەیی یە ناکەوێت، چونکە پێشکاری [بەردەوامی] هەڵ دەگرێت و ئەو پێشکارە دەبێت بە دامرێنەر بۆ جێناوە وەرچەرخاوەکان، وەك:

دە (مان) گرت [-] (-)

بـ (مان) گرت [با] (-)

بـ (مان) گرت [بـ] (ێت)

یان،

دە (مان) سووتاند [-] (-)

بـ (مان) سووتاند [با] (-)

بـ (مان) سووتاند [بـ] (ێت)

بە ئاشکرا دیارە کە خانە بەتاڵەکانی جێناو لە رستەی ئاشکرا و نیازدا و خانەی (ێت) لە رستەی گوماندا گیانی بەرکارێکەسی سێیەمی [نادیار] دەدەن بە رستەکە و لەبەر ئەوە لە ستوونە جێناوەکەی رابردوودا روخساری نییە وەك [م، یت، (-)، ین، ن، ن]. بەڵام ئێستا ئەگەر رستەکە لە بوونەوە وەرچەرخا بەسەر کەسی سێیەمی کۆدا، وەك :

ئێمە هە (مان) [-] (ن)

ئێمە هە (مان) [با] (ن)

ئێمە هە (مان) [بـ] (ن)

ئەوا جێناوی بەرکاری وەرچەرخاو (ن) ئاشکرا و دیارە هەر لەبەر ئەوە ئەو رستانە بەرامبەر بەئەم رستانە دەوەستن :

دە (مان) گرت [-] (ن)

بـ (مان) گرت [با] (ن)

بـ (مان) گرت [بـ] (ن)

تێکرای ئەم بیرو بۆ چوونانە بۆ ئەوە دەچن کە جێناوی بەرکار [م، یت، (-)، ین، ن، ن]هەر هەموویان یەك گروپ بن بەڵام لە کەسی سێیەم دا

بە بۆنەی بوون و دیاردەی وەرچەرخانەوە نەختێك ئاوێتە بوون پەیدا بووە و نەختێك تەم و مژ هاتۆتە کایەوە.

### ٧: ٥– ڕێژەی بنەڕەت:

ئەگەر بیر بگوشین لە ئاستی ئەم بەشە دا، دەتوانین بڵێین کە [ڕێزمانی کار] لە زمانەکەدا دوو بەشە:

<u>بەشی یەکەم</u>: بەشی بنەڕەت: ڕێژەی ڕانەبردوو

<u>بەشی دووەم</u>: بەشی یاریدەدراو: ڕێژەی ڕابردوو

ئەگەر بەشی یەکەم وەك ڕەگ و ریشاڵی دارێك بێت بەڵام بەشی دووەم بریتی‌یە لە لق و پۆ و گەڵاکەی. لەئێرەدا چۆن دار هەر بریتی نی‌یە لە ڕەگ و لق و پۆ لە نێوان ئەوانەدا لەشە ستوونی‌یەکەی هەیە، لە نێوان ئەو دوو بەشەدا دەبێت بەشێکی تر هەبێت بۆ پێکەوە بەستن، یان بۆ یاریدەدان. لە زمانەکەدا بەشی یاریدەدەر دەکەوێتە سنووری ڕانەبردووەوە هەر لەبەر ئەوە دەتوانین بەشی بنەڕەت بکەین بە دوو ژێر بەشەوە، وەك :[٦٦]

ژێر بەشی: کارە ئاسایی‌یەکان

ژێر بەشی: یاریدەدەر

ژێر بەشی یاریدەدەریش بریتی‌یە لە دوو ڕێگا:

<u>ڕێگای یەکەم</u>: یاریدەدەری کاری تێنەپەڕ [بوونی تی‌نەپەڕ]

<u>ڕێگای دووەم</u>: یاریدەدەری کاری تێپەڕ [بوونی تێپەڕ]

له نێوان ڕێگای یەکەم و دووەم دا دیاردەی وەرچەرخان هەیە. لەئێرەدا وا دەردەکەوێت کە وەرچەرخان هەر لە ڕانەبردوودا ڕوو دەدات ولەهەمان کات دا دیاردەیەکی بنەڕەتی یە. پاش ئەم بۆچوونانە، ئەوەی وترا لەسەر نەخشەیەك بەئەم چەشنە دەردەخەین، (وێنەی ٤).

ئێستاش دەتوانین ئەو نەخشە بە نووسین شیتەڵ بکەینەوە، وەك:

یەکەم: بەشی بنەڕەت [ڕانەبردوو] پێك هاتوو لە دوو لق. لقی یەکەم بریتی یە لە هەموو کاری تێپەڕ و تێنەپەڕی زمانەکە تەنانەت هەتا [بوونی بوونایەتی]یش. لقی دووەم بریتی یە لە لقی [بوون].

دووەم: لقی [بوون] دەبێت بە دوو لق. لە لقی یەکەم دا کاری بوون پارچۆلکەی [هە] وەردەگرێت دەبێت بە کاری [هەبوون]. لە لقی دووەم دا [بوون] ڕۆڵی یاریدەدان دەبینێت بە پوختەیی.

سێیەم: لقی هەبوون دەبێت بە دوو لقی تر. لقی یەکەم بریتی یە لە [هەبوونی ئاسایی تێنەپەڕ]، کە کارێکی پێویستە لە زمانەکەدا بۆ واتای [هەیی] یان [ئارایی: هەبوون لە ئارادا]. لقی دووەم بریتی یە لە [هەبوونی وەرچەرخاوی تێپەڕ] کە کارێکی پێویستە لە زمانەکەدا بۆ واتای [خاوەنێتی].

چوارەم: لقی [بوون] دەبێت بە دوو لقی تر. لقی یەکەم بریتی یە لە [بوونی ئاسایی تێنەپەڕ] و لقی دووەم بریتی یە لە [بوونی وەرچەرخاوی تێپەڕ]. ئەرکی ئەم دوو لقە بریتی یە لە [یاریدەدان] لە زمانەکەدا. یەکەمیان بە شێوەیەکی ئاسایی و دووەمیان بە شێوەیەکی وەرچەرخاو بەرەو تێپەڕ.

پێنجەم: یاریدەدان دوو جۆرن لە زمانەکەدا:

١- یاریدەدان لە رانەبردوودا

٢- یاریدەدان لە رابردوودا

پاشان یاریدەدان لە رانەبردوودا دووجۆرن:

١- یاریدەدانی ناو بۆ دروست کردنی کار:

تێنەپەڕ: من [—] [-] (م) :بێ پاڵپشت

تێنەپەڕ: من [زیرەك] [-] (م) : لەگەڵ پاڵپشت

تێپەڕ: من [سەرما] [-] (م)(ـە) : بەوەچەرخاوی

٢- یاریدەدانی رێژەی رابردووی تەواو:

تێنەپەڕ : شیلان خەوتوو (ە) : ئاسایی

تێپەڕ : من ناردوو (م) (ـە) : وەرچەرخاو

**٧: ٦- رێژەی رۆنراو بە یاریدە :**

ئەم رێژەیە بریتی‌یە لە رابردوو لە هەموو کاری زمانەکەدا. لە ئەم رێژەیەدا بە جوانی و بە ئاشکرایی جێ پێی بوونی یاریدە دیارە بەروخساری کارەوە، بە تایبەتی لە رستەی گومان و لە رستەی نیازدا بە پێی ئەم هاوکێشەیە:

رێژەی رابردوو = [رێژەی بنەڕەت] + [نیشانەی رابردوو] +[رێژەکانی بوون]

لەئێرەدا رێژەی بنەڕەت یەکسانە بە رێژەی رانەبردوو. نیشانەی ربرادووش بریتی‌یە لە یەکێك لەئەم پێنج پیتە [أ، د، ت، ی، و]. رێژەکانی بوون دەتوانن

رانەبردوو یان رابردوو بن بەپێی دەمکاتی رستەکە. ئێستاش دەتوانین نەخشەیەك بۆ ئەم بابەتە بکێشین (وێنەی ٥).

لەبەر رووناکی ئەم وێنەیە دەتوانین ئەم خالانە جێگیر بکەین:

یەکەم: هەموو رابردوویەك بریتی یە لە رێژەیەکی کۆکراوە لە [رێژەی بنەرەت] و نیشانەی رابردوو [أ، د، ت،ی،و] لەگەلَ رێژەکانی کاری [بوون].

دووەم: رێژە رانەبردووەکانی [بوون] دەتوانن رابردووی نزیك و بەردەوام دروست بکەن.

سێیەم: رێژە رابردووەکانی [بوون] دەتوانن رابردووی دوور دروست بکەن.

چوارەم: رێژە رابردووەکانی [بوون] دەتوانن رابردووی تەواو دروست بکەن بەمەرجێك واتای [ئێستایی] رێژەکە بپارێزن ئەویش بە کپ بوونی بنجی کاری [بوون]و بە زیندوو کردنەوەی جێناوی [ـە] بۆ کەسی سێیەمی تاك لە کاری تێپەڕ و تێنەپەڕدا.

پێنجەم: رێژەی رابردوی دوور و رابردووی تەواو دوو نیشانەی رابردوو هەلَ دەگرن، یەکەمیان بۆ کارەکە خۆی و دووەمیان هی رێژەی رابردووی کاری [بوون]ە. هەر لەبەر ئەمە ئەم دوو رابردووە واتای دوورایەتی دەبەخشن.

شەشەم: [بوون] دەتوانێت یاریدەی خۆیشی بدات، وەك:

من بووم، من بوو بام، من بوو بم




وێنەی (٤): دابەش بوونی ڕێژەی ڕانەبردوو (ڕێژەی بنەڕەت).




وێنەی (٥): دابەش بوونی ڕێژەی ڕابردوو

هەر لەبەر ئەوە زۆر ئاسایی یە ئەگەر دووجار روخساری [بوو] دەربکەوێت لە ربرادووی دووری ئەم کارەدا، وەك:

من بوو بووم

خۆزگا من بوو بووبام

رەنگە من بوو بووبم

حەتەم: ئەوەی لە خاڵی پێشتردا باس کرا دەتوانێت بەسەر [هەبوون]یش دا پیادەبکرێت، وەك:

تۆ هە بوو بوو یت [تێنەپەڕ]

یان من هەم بوو بوو [تێپەڕ]

هەشتەم: ئەو ناوانەی کە بەیاریدەی [بوون] لە رانەبردوودا رێژە دروست دەکەن بەبێ خەم بەرەو رابردوو دەرۆن لەگەڵ رێژەکانی رابردووی بوون دا، وەك:

من مامۆستا م ، من مامۆستا بووم

من هەمە ، من هەم بوو

نۆیەم: هەندێك کردار لەسەر ئەندازەی [هەبوون] وەردەچەرخێن لە رانەبردوودا، وەك:



دەکەوێت ، دە م کەوێت

دەبێت ، دە مان بێت

ئەم ڕێژانە لەسەر ئەندازەی (هەبوون) ڕوو دەکەن لە ڕابردوو ، وەك:

دەکەوت، دە (م) کەوت

دەبوو، دە (مان) بوو

ئەم ڕێزە تایبەتی‌یە بەبێ بگۆڕی دەرەکی دروست نابێت چونکە جێگۆڕکێی جێناوە وەرچەرخاوەکەی سەر ناگرێت.[٦٨]

## ٧: ٧- جێناوی بنەڕەت:

ئەگەر بیر بگوشین لەسەر جێناوی لکاو، لەئەم نووسینەدا دەگەین بە چەند ڕاستی‌یەك کە بنچینەی زانستی بۆ ڕێزمانی جێناو دابین دەکات لە ڕستەدا. ئەم بۆ چوونانەش دەبن بە سەرەتاو بە ساخ کەرەوەی ڕێزمانی جێناوی لکاو کە تا ئێستا مەوداکەی هەر گەیشتووە بە ڕۆخی جێناو بەڵام نەگەیشتووە بە ناخی جێناو. ئێستاش ئەگەربە نێو بابەتی ڕێزمانی [بوون و هەبوو]دا بڕۆین دەتوانین بە ئەم چەشنە بۆ چوونەکان دیاری بکەین:

یەکەم: ڕێژەی بنەڕت [ڕانەبردوو]. وەك سەلمێنرا کە بنەڕەتی‌یە دەبێت ئەو جێناوانەی کە بەکار دەهێنرێن تیّ‌ی‌دا بنەڕەتی بن. هەر لەبەر ئەوە دەتوانین خشتەیەك دیاری بکەین بۆ جێناوی بنەڕەت، ( خشتەی ١ و ٢ ستوونی ڕانەبردوو). ئەم دوو ریزە جێناوە نابراون بە گرووپی یەکەم و گرووپی دووەم لە ڕێزمانی نووسراودا. جێناوەکانی بکەر ڕەنگ دانەوەی کاتی [ئێستایی و داهاتوویی] دەکەنەبەری ڕێژەی ڕانەبردوو.

دووەم: ئەو جێناوانە روخسار دەپارێزن لە هەموو رێزمانەکەدا تەنها لە کەسی سێیەمی تاك دا نەبێت بەڵام بە رێگایەکی زۆر ئاڵۆز. لە کاری [بوون و هەبوون]دا، بە تەنها روخسار دەگۆرێت بۆ [ـە] و رێزیکی تر لە جێناو پەیدا دەبێت، (خشتەی ۲ ستوونی رانەبردوو). ئەم جێناوانە تەنها رەنگ دانەوەی گیانی [ئێستایی] دەبەخشن بە رێژەی بنەرتییەکانی [بوون و هەبوون]، ئەم روخسار گۆرینە، کە هەر لە کەسی سێیەم دا دەرکەوتووە، رەنگە هی ئەوە بێت کە گیانی [داهاتوویی] لە ناوبراوە.

سێیەم: کرداری [بوون و هەبوون] لە کەسی سێیەمی تاك دا لە رستەی نیاز و گومان دا، روخساری جێناوەکە دەگۆرێت وەك لە سەر خشتەی (٦) دەرخراوە. لە ئەو خشتەیەدا، دەبینین کە لە رستەی ئاشکرادا [ێت] بووە بە [ـە] کەچی لە رستەی گومان دا بووتەوە بە [ێت] جارێکی تر. لە رستەی نیازدا دوو جۆر بەکارهێنان هەیە کە لە هەندێك ناوچەدا جێناوی کەسی سێیەم دەبێت بە [نادیار] وەك [ئەو هەبا] لە هەندێك ناوچەی تردا هەر دیاردەبێت، وەك [ئەو هەبایە]، بەڵام پیتی [ی] هەڵ دەگرێت بۆ ناوەندی دوو بزوێن.

لەئێرەدا دەتوانین بیر بگوشین و بڵێین جێناوە بنەرەتییەکان هەر یەك روخساریان هەیە تەنها بۆ کەسی سێیەمی تاك نەبێت کە سێ روخساری هەیە. روخساری [ێت] بۆ کرداری ئاساییەکان و رستەی گومان لە [بوون و هەبوون]دا. روخساری [ـە] تەنها بۆ رستەی ئاشکرا ، [نادیار یان (ـە)] بۆ

رستەی نیاز لە رستەی [بوون و هەبوون]دا، بەئەم شێوەیە جێناوی بنەڕەت لە رۆڵی بکەردا بریتی‌یە لە [م، یت(ێت/ ـ/ە)، ن، ن].[٦٩]

چوارەم: ئەوەی جێناوی بنەڕتی‌یە لە رۆڵی بەرکاردا کە بریتی‌یە لە [م، ت، ی، مان، تان، یان]هەر یەك روخساریان هەیە.

## ٧: ٨– رەنگ دانەوەی دەمکات لە رێژەدا:

یەکەم: رێژەی بنەڕت، (رێژەی رانەبردوو):

دەتوانین رەنگ دانەوەی کات بە ئەم چەشنە دیاری بکەین. (وێنەی ٦).

وەکوو لە سەر وێنەکە دەردەخراوە، کارە ئاساییەکان دوو واتا دەبەخشن یەکەمیان واتای [روودانی ئێستایی و بەردەوامی]و دووەمیان واتای [روودانی داهاتوویی]. بەرامبەر بە ئەم فرە واتاییە کاری بوون [بوون و هەبوون] هەر بە تەنها واتای [روودانی ئێستایی] دەبەخشێت، واتە [تاك واتا]یە و گیانی داهاتوویی نەماوە تێ‌ی‌دا.

دووەم: رێژەی رۆنراو، (رێژەی رابردوو):

لە ئەم رێژە رۆنراوە دا رەنگ دانەوەی کات، هەرچەندە هەریەکە بەلام بە پێ‌ی دەمکات نەختێك ئالۆزیی هەر هەیە. وەك لە ئەم وێنەیەدا دەری دەخەین (وێنەی ٧). لەئێرەدا بە ئاشکرا دەرخرا کە تەنها رابردووی تەواو واتای [رابردوویی و ئێستایی]هەیە تێ‌ی دا بەلام مەودای کاتی روودانی رابردووی [نزیك، بەردەوام، دوور] بەهیچ جۆرێك ناگات بە [ئێستایی]. بە شێوەیەکی تر دەتوانین بڵێ‌ین گیانی [فرە واتایی] وەك لە رانەبردووی

کرداره‌ئاساییی‌یه‌کان دا هه‌بوو، له‌ رابردووی ته‌واویش دا هه‌یه‌ و هه‌موو ڕێژه‌کانی تری رابردوو و رانه‌بردوو گیانی [تاك واتایی] هه‌یه‌ تێیان دا.[70]

سه‌باره‌ت به‌ پۆلین کردنی ده‌مکات، تاکوو ئه‌مرۆ، له‌ ڕێزمانی نووسراودا، سێ جۆر ده‌مکات دیاری کراوه‌ بۆ ڕێژه‌کانی کردار، وه‌ك:

- رانه‌بردوو
- رابردوو
- فه‌رمان

وڕێژه‌ی رابردووش وابه‌ش کراوه‌ بۆ:

- رابردووی نزیك
- رابردووی به‌رده‌وام
- رابردووی دوور
- رابردووی ته‌واو

ئه‌گه‌ر ئێمه‌ وه‌کوو بیرگوشی زانستی بتوانین له‌ بیرگوشین دا بگه‌ین به‌ چینێکی‌تر له‌ قولایی ناخی زمانه‌که‌ دا، ده‌بینین که‌ زۆر له‌ ڕێژه‌کانی کار سیمای دووکاتی وه‌رده‌گرن، وه‌کوو له‌سه‌ر وێنه‌ (٦ و ٧) ده‌رخراوه‌، به‌ ئه‌م چه‌شنه‌، (بڕوانه‌ بۆ خشته‌ی ٢٤، ٢٥):

<u>یه‌که‌م</u> :- کاتی [ئێستایی]: کاری [بوون] و کاری [هه‌بوون]به‌ ته‌نها ئه‌م کاتی ڕوودانه‌ ده‌به‌خشن له‌ ده‌مکاتی رابردوودا.[71] مۆرکی [ئێستایی] به‌ ته‌نها به‌ چوار شێوه‌ ده‌رده‌که‌ون له‌ ڕوخساری فیزیاوی ڕێژه‌که‌دا.

١- خانه‌ی [ده‌] بۆش ده‌بێت.




وێنەی(٦): دابەش بوونی ڕێژەی بنەڕەت (ڕانەبردوو).




وێنەی(٧): دابەش بوونی ڕێژەی ڕۆنراو(ڕابردوو).

٢- خانەی [بنج] بۆش دەبێت لە شێوازی ئاشکرادا.

٣- روخسار گۆڕینی جێناوی کەسی سێیەمی تاك بۆ [ـە] لە شێوازی ئاشکرادا.

٤- دەرکەوتنی پێشکاری نەرێ بەروخساری [نی]، لە رانەبردوو دا.[٧٢]

دووەم:- کاتی [ئێستایی + بەردەوامی + داهاتوویی] : هەموو کارە ئاسایی یەکان لە رێژەی رانەبردوودا ئەم دوولایی یە دەبەخشن لە کاتی روودان دا. مۆرکی ئەم رێژەیە بە ئەم خاڵانە دەردەکەون لە روخساری فیزیاوی رێژەکەدا.

١- هەبوونی خانەی بەردەوامی [دە].

٢- هەبوونی خانەی بنجی کارەکە.

٣- دەرکەوتنی جێناوی [ێت] بۆ کەسی سێیەمی تاك.

٤- دەرکەوتنی بەرکاری (نەرێ) بە روخساری (نا) لە رانەبردوودا.

سێیەم: کاتی [رابردوویی]، هەموو کرداری زمانەکە، چی ئاسایی یەکان و چی بوون و هەبوون، لە رابردووی نزیك دا تەنها واتای [رابردوویی] دەبەخشن. مۆرکی ئەم کاتە یەکلایی یە بە ئەم روخسارە فیزیاوی یانە دەناسرێتەوە لە رێژەدا:

١- هەبوونی یەك خانەی رابردووی نزیك، واتە هەبوونی یەکێك لە ئەم بیتانە لە خانەکەدا [ا]، [د]، [ت]، [ی] یان [و].

٢- دەرکەوتنی خانەی جێناوی کەسی سێیەمی تاك بە شێوەی [نادیار]، چی لە رۆڵی بکەری تێنەپەڕدا و چی لە رۆڵی بەرکاری تێپەڕدا.

چوارەم: کاتی [رابردوویی - بەردەوامی]: ئەم کاتە دوولایی‌یە کە بەردەوامی دەبەخشێت لە رابردوودا تەنها لە رابردووی بەردەوام دا دەردەکەوێت. ئەم مۆرکانەش بە روخساری فیزیاوی رێژەکەوە دەردەکەوێت :

١- هەبوونی خانەی [بەردەوامی]، خانەی [+١].

٢- دەرکەوتنی خانەی جێناوی کەسی سێیەمی تاك بە شێوەی [نادیار] چی لە رۆڵی بکەردا و چی لە رۆڵی بەرکاردا، خانەی [-٧].

٣- هەبوونی یەك خانەی رابردووی نزیك، خانەی [-٢].

پێنجەم: کاتی روودانی [برادوویی - رابردوویی]: ئەم کاتە رابردووە دوولایی‌یە لە ربرادووی دووردا دەردەکەوێت. ئەم مۆرکانەش بە روخساری رێژەکەوە دەردەکەوێت.

١- هەبوونی دوو خانەی رابردووی نزیك، واتە هەبوونی دوو نیشانەی رابردوو. یەکەم پیتی رابردوو بریتی‌یە لە یەکێك لە [ا]، [د]، [ت]، [ی]، یان[و] و دووەمیان بریتی‌یە لە پیتی رابردوو [و] لە خانەی [بوو]دا کەوا لە بوونی یاریدەدەرەوە هاتووە.

٢- دەرکەوتنی خانەی جێناوی کەسی سێیەمی تاك بە شێوەی [نادیار]، چی لە رۆڵی بکەردا و چی لە رۆڵی بەرکاردا، خانەی [-٧].

شەشەم: کاتی ڕوودانی [ڕابردوویی + ڕابردوویی + ئێستایی]: ئەم کاتە سێ لایی یە تەنها لە ڕبرادووی تەواودا بەدی دەکرێت. ئەم مۆرکانەش بە ڕوخساری فیزیاوی ڕێژەکەوە دەردەکەون:

١- دەرکەوتنی دوو پیتی ڕابردوو، یەکەمیان لە چەشنی [ا]، [د]، [ت]، [ی]، یان [و].

دووەمیان لە چەشنی [و] لە خانەی [بوو]دا.

٢- لاچوونی بنجی [بوون] کە بریتی یە لە [بـ] لە [بوو]دا. بە ئەم چەشنە لە خانەی ڕابردووی دووردا تەنها پیتی ڕابردووی (بوون) دەردەکەوێت. لە ئێرەدا بەخواردنەوەی بنجەکەی [بوو] گیانی ئێستایی دەچێتە سەر ڕستەکە، وەك:

ئێستا [تۆ] [کەو] [تـ] [(-) (وو)] (یت)

٣- دەرکەوتنی جێناوی کەسی سێیەمی تاك بە شێوەی [ـە]، چی لە ڕۆڵی بکەردا. و چی لە ڕۆڵی [بەرکار]دا. ئەم دوو ڕەفتارەی دوایی لە خاڵی [دووەم]ەوە هاتوون.

بێگومان ڕەنگ دانەوەی ئەم شەش کاتی ڕوودانە لەسەر پلیکانەی ڕستە دەرخرا (خشتەی ٢٤). پاشان بابەتی سەر ئەو خشتەیە بە شێوەیەکی تر پۆلین کرا و سنووری دەمکاتەکان دیاری کرا بە جوانی (خشتە ٢٥).[٧٣]

| کاتی رودان (رەنگ دانەوەی کات) | پلیکانەی ڕێژەکان | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | دە | بنج | ین | ر | نزییک | بـ | وو | با | ـ |
| | +١ | سفر | -١ | -٢ | -٣ | -٤ | | -٥ | -٧ |
| [ئێستایی] | X | X | X | X | X | X | X | X | (ـە) |
| [ئێستایی+بەردەوای + داهاتوویی] | ✓ | ✓ | — | — | X | X | X | X | ێت |
| [رابردوویی] | X | ✓ | — | — | ✓ | X | X | — | X |
| [رابردوویی + بەردەوامی] | ✓ | ✓ | — | — | ✓ | X | X | — | X |
| [رابردوویی +رابردوویی] | X | ✓ | — | — | ✓ | ✓ | ✓ | — | X |
| [رابردوویی+رابردوویی + ئێستایی] | X | ✓ | — | — | ✓ | X | ✓ | — | (ـە) |

خشتەی (٢٤): رەنگ دانەوەی کات لەڕێژەدا.




خشتەی (٢٥) :رەنگ دانەوەی کات لەدەمکاتەکانی رێژەدا.

## ٧: ٩- پوختەی بەشی حەوتەم:

بە بیر گوشینێکی زانستیانە دەتوانین رێژەی بنەڕەت، کە بریتی‌یە لە رێژەی رانەبردوو، دابەش بکەین بەسەر دوو بەش دا.

یەکەم: رانەبردووی کارە ئاسایی‌یەکان (رانەبردووی سادە)

دووەم: رانەبردووی بوون و هەبوون (رانەبردووی تەواو)

لەئێرەدا کەوترا کارە ئاسایی‌یەکانی هەموو کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ دەگرێتەوە و تا دەگات بە [بوونی بوونایەتی]. بەڵام کەوترا [بوون و هەبوون] ئەوا دووشتی جیاواز پەیدا دەبن:

یەکەم: [بوون] بۆ یاریدەدان

دووەم: [هەبوون]، وەك كارێكی تایەبەتی لە زمانەكەدا.

ئەم دوو كارە وەك یەكەم هەنگاوی وەرچەرخان لە بنەڕەتەوە دیوی وەرچەرخاو دەنوێنن. هەر یەكێك لە ئەو دووكارە دابەش دەبن بۆ دیوی ئاسایی و دیوی وەرچەرخاو:

یەکەم: [بوون]ی ئاسایی و [هەبوون]ی ئاسایی: تێنەپەڕ

دووەم: [ بوون]ی وەرچەرخاو و [هەبوون]ی وەرچەرخاو: تێپەڕ



هەر دوو دیوەكەی [بوون] وەك كارێكی تایبەتی دوو ئەركی دیاری كراویان هەیە، وەك:

یەکەم: هەبوونی ئاسایی‌ی تێنەپەڕ:

[هەبوونی شتێك یان كەسێك لە ئاستی خۆیی‌دا یان بە واتای هەیی]

دووەم: هەبوونی وەرچەرخاوی تێپەڕ:

[هەبوونی شتێك یان كەسێك لە ئاستی شتێك یان كەسێكی تردا بە واتای خاوەنێتی و هەبوونایەتی]

هەر دوو دیوەكەی [بوون] وەك كارێكی یاریدەدەر دەتوانن ئەم ئەركانە جێبەجێ بكەن:

<u>یەكەم: یاریدەدان بێ پاڵپشت:</u>

وەك: ئاسایی :[منم، تۆیت، ئەوە، ئێمەین، ئێوەن، ئەوانن]

یان بە وەرچەرخاوی: [من گەرمامە، تۆ گەرماتە، ئەو گەرمایەتی، ئێمە گەرمامانە، ئێوە گەرماتانە، ئەوان گەرمایانە].

<u>دووەم: یاریدەدان بە پاڵپشت:</u>

وەك: ئاسایی :[من زیرەكم، تۆ زیرەكیت، ئەو زیرەكە، ئێمە زیرەكین، ئێوە زیرەكن، ئەوان زیرەكن]

یان وەك: وەرچەرخاو:پاڵپشت وەرناچەرخێت مەگەر بكرێت بە بكەر (بروانە خاڵی یەكەم).[٧٥]

<u>سێیەم: یاریدەدانی هەموو رێژەكانی رابردوو:</u> لەنێرەدا هەموو رابردووی كارەكانی زمانەكە دەگرێتەوە تا دەگات بە [بوون و هەبوون]یش.[٧٦]

تەنها جیاوازی لە ئەم بوارەدا دەگەرێتەوە بۆ هیزی تێپەڕین، وەك:

یەكەم: كارە تێنەپەڕەكان لەگەڵ رێژەكانی بوونی ئاسایی دەبن .

دووەم: كارە تێپەڕەكان لەگەڵ رێژەكانی بوونی وەرچەرخاو دەبن.

ئەم یاریدەدانەش سێ جۆرن.

یەكەم: رابردووی نزیك و بەردەوام:

لەگەل ڕێژە ڕانەبردووەکانی [بوون] بەلام پاش کوشتنی گیانی [ئێستایی] لە ڕستەکەدا.

دووەم: ڕابردووی دوور:

لەگەڵ ڕێژە ڕابردووەکانی (بوون).

سێیەم: ڕابردووی تەواو :

لەگەڵ ڕێژەکانی ڕابردووی [بوون] بەلام بە پاراستنی گیانی [ئێستایی] لە ڕستەکەدا. گیانی [ئێستایی]یش بە دوو میکانیزم دەپارێزرێت. یەکەمیان بە [نادیاری ڕەگی بوون] و دووەمیان بە دەرکەوتنی [ـە] لەجێی جێناوی ڕەسەنی کەسی سێیەمی تاك .

ئەمەبوو ڕێژەی بنەڕەت و ئەرکەکانی، ئەمەش بوو ڕێژەی ڕۆنراو [ڕابردوو]. بە بیر گوشینێکی تر دەتوانین بلێین [ڕابردوو] خاوەنی هیچ نییە تەنها پێنج پیت نەبێت (ا، د، ت، ی، و) و هەموو پەل و پۆکانی تری ڕابردوو لە ڕێژەی بنەڕەت (ڕانەبردوو) خوازراون بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ (ڕابردووی نزیك و بەردەوام) یان ناڕاستەوخۆ (ڕابردووی دوور و تەواو). ئەمەبوو پوختەی بنچینەکانی ڕێزمانەکە و ئەوەش کە لە ئەم پوختەیەدا باس نەکرا هیچ ناگۆڕێت لە ناوەرۆکی بابەتەکە. تەنها سەرنج کەوا شایانی وتن بێت ئەوەیە کە کاری ئاسایی لە ڕانەبردوودا ڕەنگ دەداتەوە بەسەر (ئێستایی و بەردەوامی و داهاتوویی) دا کەچی (بوون) و (بوونی بوونایەتی) بەهەردوویان ئەمجا ڕەنگ دانەوەی کارێکی

ئاسایی نەردەخەن، وەك لەسەر خشتەی (٢٥) دەرخراوە. واتە (بوون) واتای ئێستایی دەداتەوە و (بوونی بوونایەتی) واتای (بەردەوامی و داهاتوویی) دەداتەوە، وەك ئەم دوو كارە ئەركی یەكتر تەواو بكەن تا بەرامبەر بە كارێكی ئاسایی بوەستن.

# بەشی هەشتەم

## ڕێژەی کەسی سێیەمی تاك

لە بەر ئەوەی کەسی سێیەمی تاك ڕێزمانەکەی زۆر ئاڵۆزە و زۆر جار بە نادیاری دەچێتە نێو ڕێژەوە، بە جوانمان زانی کە بایەخێکی تایبەتی بدەین بە ئەم بابەتە. هەر لەبەر ئەوە پلە پلە ڕێزمانەکەی شیتەڵ دەکەینەوە. لەگەڵ ئەوەش دا، ئەم بەشە خۆی لەخۆیدا بریتییە لەپێداچوونەوەیەکی پوختە بەسەر بەشەکانی پێشتردا ویان بەدیاری کراوی بەسەر میکانیزمی وەرچەرخان ومیکانیزمی ڕۆنانی ڕێژەی ڕابردوودا.

<u>١:٨- ڕێژەی ڕانەبردوو لە کارە ئاسایییەکان دا :</u>

یەکەم - ڕێژەی تێنەپەڕ : لە ڕێژەی تێنەپەڕدا تەنها هەر (بکەر) هەیە و کۆمەڵە جێناوەکەی سەر وێنەی (٨) بەکار دەهێنرێت. ئەو کۆمەڵە جێناوە بێ گومان دەبن بە بارگەی خانەی [-٧] کە جێ نەگۆڕە. لەئەوێدا جێناوی کەسی سێیەمی تاك بریتی یە لە (ێت).[٧٧]

دووەم - ڕێژەی تێپەڕ : لە ڕێژەی تێپەڕ دا (بکەر) و (بەرکار) هەن. جێناوی (بکەر) پڕ بە پڕ یەکسانە بە ئەوانەی کە لە سەر وێنەی (٨) دەرخراون بۆ هەموو کەسەکان. بەڵام بۆ بەرکار ستوونە

جێنـاوێکی تـر بـەکار دەهێـنرێت، (وێنـەی ٩) بـێ گومـان ئـەو جێناوانە بریتین لە بارگەی خانەی [-٦] کە جێ گۆڕە. لە ئەو نەخشەیەدا جێناوی کەسی سێیەمی تاك بریتی یە لە (ی). لە لایەکی ترەوە، ئەو کۆمەڵە جێناوە، وەك (بەرکار)ن لە رستەی رانەبردوودا، دەتوانن رستەکە ئازاد بکەن و بە بێ ئەوەی هیچ بەرکارێکی (نادیار) لە رێزەکەدا بە جێ بمێنێت، وەك :

(نامە) دەنێرم : دە (ی) نێرم : دەنێرم [٧٨]

ئەم دیاردەیە لە رێزەی رانەبردوودا هەیە بەڵام لە رابردوودا رێزە دەرباز نابێت لە بەرکار بە هیچ جۆرێك.سەبارەت بە شوێنی ئەو دوو جێناوە لەرستەدا، خانەی [-٦] بەرکارەکە هەڵ دەگرێت و خانەی [-٧] بکەرەکە هەڵ دەگرێت. بە واتایەکی تر ئەم بنەمایە لە ریزی رستەی رانەبردوودا دەپارێزێت :

بەرکار [-٦] پاشان بکەر [-٧]

٢:٨- رێزەی رانەبردوو لە بوون و هەبوون دا :

یەکەم : بوون و هەبوونی تێنەپەڕ (بەبێ وەرچەرخان):

لەبەر ئەوەی ئەم دوو کردارە بە تەنها واتای (ئێستایی) دەبەخشن ریزە جێناوەکەی سەر وێنەی (٨) دەگۆڕێن بۆ وێنەی (١٠). ئەم کۆمەڵە جێناوەی سەر وێنەی (١٠) دەبنەوە بە بارگەی خانەی [-٧] بەڵام ئەم جارەیان واتای

| | ٧- |
|---|---|
| من: | م |
| تۆ: | یت |
| ئەو: | ێت |
| ئێمە: | ین |
| ئێوە: | ن |
| ئەوان: | ن |

وێنەی (٨): جێناوی بکەر،

ستوونی بکەری رانەبردوو

(خشتەی ١ و ٢)

| | ٦- |
|---|---|
| من: | م |
| تۆ: | ت |
| ئەو: | ی |
| ئێمە: | مان |
| ئێوە: | تان |
| ئەوان: | یان |

وێنەی (٩): جێناوی بەرکار

ستوونی بەرکاری رانەبردوو

(خشتەی ٢).

کاتی (ئیستایی) هەڵدەگرن لە ریزەدا. ئەم بۆ چوونە لە کەسی سێیەمی تاك دا بە ئاشکرا دەرکەوتووە و روخسارەکەی گۆراوە بۆ (ـە). لە راستی دا ئەو رەگەزە دەگەریتەوە بۆ کاتی( ئێستایی ) نەك بۆ جێناو. هەر لەبەر ئەوە دەتوانین خانەی [-٧] دابەش بکەین بۆ دوو ژێر خانەی تر، وەك لە سەر وێنەی (١١) دەرخراوە. لە ئەو وێنەیەدا کەسی سێیەمی تاك بە تەنها مۆرفیمی ئێستایی هەڵ دەگرێت و جێناوەکەی نادیارە. بەرامبەر بە ئەم بۆ چوونە پێنج کەسەکەی تر دیارن بە روخسار و رەگەزی (ـە) هەڵ ناگرن. ئەم دابەش کردنە بۆ پێویستی لێ کۆڵینەوە ئەنجام دراوە بەلاّم نیشانەی پێکاوە و بووە بە هۆی دەرخستنی میکانیزە نەزانراوەکانی زمانەکە. ئێستاش دەتوانین خانەی [-٧] بە ئەم چەشنە وێنە بکێشینەوە و بۆ کەسی سێیەمی تاك، وەك لەسەر وێنەی (١٢) دەرخراوە. لە ئەو نەخشەیەدا راستی یەك خۆی دەچەسپێنێت ئەویش ئەوەیە :

**[ بۆ بوون وهەبوون جێناوی بکەر بۆ کەسی سێیەمی تاك نادیارە، بەلاّم مۆرفیمی ئێستایی (ـە) دەرکەوتووە لەجێی. ئەم دیاردەیە پێچەوانەیە لەگەلّ پێنج کەسەکەی تر]**

دووەم : <u>بوون و هەبوونی تێپەڕ (وەرچەرخاو) :</u>

کاتێك کە (بوون و هەبوون) وەردەچەرخێن بۆ تێپەڕ دوو شت روو دەدات :

یەکەمیان : گۆڕینی ئەرکی جێناوی بکەر( وێنەی ١١ ) بۆ (بەرکار).




وێنەی (١٠): جیناوی بکەر لە بوون وهەبوون دا




وێنەی (١١): دابەش کردنی خانەی (-٧ )

دوودەمیان : گۆڕینی ئەرکی جێناوی بەرکار (وێنەی ٩) بۆ (بکەر).

دەتوانین ئەم بۆ چوونە بە هێلکاری یەك دەربخەین، لە سەر وێنەی (١٣).

لە ئەو وەرچەرخانەدا، ئەگەر کەسی سێ‌یەمی تاك لە بوون و هەبوون دا وەرچەرخا بۆ (بەرکار) بە سەر هەر شەش کەسەکەدا، وێنەی (١٤) دروست دەبێت.

لە ئەم وەرچەرخانەدا بکەری نادیار لە کەسی سێ یەمی تاك دا (دەرخراوە لە سەر وێنەی ١١، ١٢) دەبێت بە (بەرکار) و ئەو ڕوخسارە نادیارەی خۆی دەفرۆشێتەوە بە هەر شەش ڕستە وەرچەرخاوەکە. جا لە بەر ئەوە هەموو ڕێژەیەکی (وەرچەرخاو) ناتوانێت لە بەرکاری نادیار دەرباز بێت.

پاش ئەم ورد بوونەوەیە، دەتوانین بڵێین ئەو ڕاستی‌یەی کە تێ‌ی‌دا وترا (بەرکار پاشان بکەر) لە ڕێژەی بنەڕەت دا، لە پاش وەرچەرخان بوو بە (بکەر پاشان بەرکار). بە واتایەکی تر هەر ڕێژەیەکی تێ پەڕ ئەگەر بە جێناوی لکاو بنەماکەی پاراست ئەوا بنەڕەتی‌یەو و ئەگەر بنەماکەش تێ‌ی‌دا بوو بە (بکەر پاشان بەرکار) ئەوا ڕێژەکە وەرچەرخاوە. ئەم دیاردانە هەموویان لە وێنەی (١٣) دا جێ‌یان دەبێتەوە. ئێستاش دەتوانین سنووری ئەو دوو بنەمایە لە ڕێژەی ڕانەبردودا دەربخەین، (وێنەی ١٥). بابەتی نێو ئەو وێنەیە تەنها ڕێژە تێپەڕکان دەگرێتەوە و ڕێژە تێنەپەڕکان

| [-٧] | |
|---|---|
| جێناو | مۆرفیمی ئێسنایی |
| نادیار | ـه |

وێنەی (١٢) خانەی [-٧] لەکەسی سێیەمی تاک دا




وێنەی (١٣): میکانیزمی وەرچەرخان

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| من: | م | - | ـه | هه مه |
| تۆ: | ت | - | ـه | هه ته |
| ئه‌و: | ی | - | ـه | هه (ی) یه :هه‌یـ ـه‌تی |
| ئیمه: | مان | - | ـه | هه مانه |
| ئیوه: | تان | - | ـه | هه تانه |
| ئه‌وان: | یان | - | ـه | هه یانه |
| | ٦- بکه‌ر | ٧- به‌کار | | |

وێنه‌ی (١٤) : وه‌رچه‌رخان به‌سه‌ر که‌سی سێیه‌می تاك دا

| رانه‌بردوو | |
|---|---|
| کاره ئاساییه‌کان | بوون وهه‌بوون |
| به‌رکار پاشان بکه‌ر | بکه‌ر پاشان به‌رکار |
| به‌بێ وه‌رچه‌رخان | وه‌رچه‌رخاو |

وێنه‌ی (١٥): نه‌خشه‌ی ده‌مکاتی رابردووی تێپه‌ر

ئەم ئالۆزیی‌یە هەڵ ناگرن مەگەر لە پاش وەرچەرخان، وەك لە (بوون و هەبوون) دا رووی داوە. ئەمەش کورتەیەکە بۆ ئەوەی وترا:

[ لە بوون و هەبوونی وەرنەچەرخاو دا کەسی سێیەمی تاك لە رۆڵی بکەردا نادیار بوو بەڵام لە پاش وەرچەرخان ئەو سیمایەی فرۆشتەوە وەك بەرکار بە هەر شەش کەسەکەی تر].

## ٢:٨- رێژەی رۆنراو بە بوونی ئاسایی (رابردووی تێنەپەر):

رێژەی رۆنراو لە بوونی (وەرنەچەرخاو)، بێ گومان، بریتی‌یە لە (رێژەی رابردووی تێ نەپەر). لە رێژەکانی بوونی وەرنەچەرخاودا (برگەی ٢ خاڵی یەکەم)، وترا کە ئەو رێژانە تێنەپەرن و تەنها بکەر هەڵ دەگرن لە خانەی [-٧] دا. لە سەر وێنەی (١٢،١١) دەرخراوە کە بکەر لە رێژەکانی (بوون) دا نادیارە بۆ کەسی سێیەمی تاك.

وەك رێژەکانی رابردوو بە (بوونی وەرنەچەرخاو) رۆدەنرێن زۆر ئاسایی‌یە کە بکەری کەسی سێیەمی تاك نادیار بێت، وەك :

یەکەم - رابردووی نزیك : لە ئەم رابردووەدا گیانی (ئێستایی) نی‌یەو بۆ ئەوە زۆر ئاسایی‌یە ئەگەر وێنەی (١١) ژێر خانەی ئێستایی فرێ بدات. وەك لەسەر وێنەی (١٦) دەرخراوە. لە ئەوێدا دیارە کە

هەردوو ژێرخانەکەی [٧-] بە تەواوی چۆڵ دەبێت لە مۆرفیمی ئێستایی و لە جێناوی کەسی سێ یەمی تاك.بە ئەم پێیە، هەر رابردوویەکی نزیکی تێنەپەڕ ئەگەر جێناوی بکەر نەما تێیدا ئەوا بکەرێکی نادیار هەڵدەگرێت بۆ کەسی سێیەمی تاك، وەك :

خەوتن: خەوت (-)

نووسران: نووسرا (-)

سووتان: سووتا (-)

بوون: بوو (-)

دووەم : رابردووی بەردەوام : ئەوەی بۆ رابردووی نزیك وترا پڕ بە پڕ دەچەسپێت بەسەر رابردووی بەردەوام دا چونکە ئەویش بە رێژەکانی بوون رۆ دەنرێت. لە ئەم هەل و مەرجەش دا بکەری کەسی سێیەمی تاك نادیارە، وەك :

خەوتن: دەخەوت (-)

نووسران: دەنووسرا (-)

سووتان: دەسووتا (-)

بوون: دەبوو (-)

سیٚیەم : رابردووی دوور : ئەم رابردووە بە ریژەکانی رابردووی (بوونی وەرنەچەرخاو) رۆدەنرێت. بە پێی خالی یەکەم رێژەکانی رابردووی نزیك بۆ (بوون) بریتی یە لە ئەوانەی لەسەر وێنەی (١٧) ریزکراون. بە ئەم پێیە زۆر ئاسایی یە کە بکەری لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك نادیار بێت لە رابردووی دووردا، وەك:

خەوتن: خەوتبوو (-)

نووسران: نووسرابوو (-)

سووتان: سووتابوو (-)

بوون: بووبوو (-)

چوارەم : رابردووی تەواو : ئەم رابردووە بە رێژەکانی رابردووی (بوون) رۆدەنرێت بەلاّم پاش زیندوو بوونەوەی (گیانی ئێستایی) کە دوو شت دەگۆڕێت لە روخساری رێژەکەی (بوون):

یەکەمیان : لابردنی بنجی (بوون).

دووەمیان : زیندوو کردنەوەی مۆرفیمی (ـە) لە کەسی سی یەمی تاك دا.

بە ئەم چەشنە وێنەی (١٧) دەبێت بە وێنەی (١٨). وەکوو دەرکەوتووە لە ئەم رابردووەش دا کەسی سێیەمی تاك نادیارە لە رۆلی بکەردا، وەك:




وێنەی (١٦) کپ بوونی فۆرنتیمی ئێستایی لە ڕێژەی (بوون) دا

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| - | م | | وو | بـ | من: |
| - | یت | | وو | بـ | تۆ: |
| - | - | | وو | بـ | ئەو: |
| - | ین | | وو | بـ | ئێمە: |
| - | ن | | وو | بـ | ئێوە: |
| - | ن | | وو | بـ | ئەوان: |
| ٧- | | | ٤- | (٠) | |

وێنەی (١٧) ڕێژەی ڕابردووی نزیك لە (بوون)

خەوتن: خەوتووە

نووسران: نووسراوە

سووتاو: سووتاوە

بوون: بووە

لە کۆتایی برگەی سێیەم دا، ئەوە دەرخرا کە : [ کەسی سێیەمی تاك نادیارە لە رۆڵی بکەردا بۆ هەر چوار جۆرەکەی رابردوو بۆ رێژەی تێنەپەڕ].

## ٤:٨- رێژەی رۆنراو بە بوونی وەرچەرخاو (رابردووی تێپەڕ):[79]

ئەم رێژەیە بریتی‌یە لە رێژەی رابردووی تێپەڕ کە بە (بوونی وەرچەرخاو) رۆدەنرێت. لەسەر وێنەی (١٤) دەرخرا کە کەسی سێیەمی تاك رۆڵی (بکەرێتی) خۆی دەفرۆشێتەوە بە وەرچەرخاوی بە هەر شەش کەسەکە بە (بەرکارێتی). واتە گیانی بەرکارێکی نادیار دەبەخشێت بە رێژەکە. لە بەر ئەوە زۆر ئاسایی‌یە هەر رێژەیەك کە بە بوونی وەرچەرخاو رۆنرابێت بەرکارێکی نادیار هەڵ بگرێت. ئێستاش هەموو جۆرەکانی رابردووی تێپەڕ شیتەڵ دەکەینەوە :

یەکەم - رابردووی نزیك : لە ئەم رابردوووەدا گیانی (ئێستایی) نیيە هەر لەبەر ئەوە مۆرفیمی (ـە) کپ دەبێت لە وێنەی (١٤) دا. ئەمەش لە سەر وێنەی (١٩) دەرخراوە. بە ئەم پێیە خانەی [-٧] ئەگەر بۆش بوو ئەوا بەرکارێکی نادیار هەڵ دەگرێت بەرامبەر بە کەسی سێیەمی تاك.

دووەم - رابردووی بەردەوام : ئەوەی بۆ رابردووی نزیك وترا پڕ بە پڕ دەچەسپێت بەسەر رابردووی بەردەوام دا. تەنها جیاوازیش ئەوەیە کە بارگەی خانەی [-٦] لە وێنەی (١٩) جێ گۆرکێ دەکات، وەك :

دە (م) نارد (-) (-) (-)

دە (ت) نارد (-) (-) (-)

دە (ی) نارد (-) (-) (-)

دە (مان) نارد (-) (-) (-)

دە (تان) نارد (-) (-) (-)

دە (یان) نارد (-) (-) (-)

بەئەم پێیە زۆر ئاسایی یە کە گیانی بەرکارێکی نادیار لە هەر شەش نموونەکەدا هەبێت.




وێنەی(١٨): ڕێژەی ڕابردووی تەواو (تێنەپەڕ)




وێنەی (١٩): ڕێژەی ڕابردووی نزیك (تێپەڕ)

سێیەم - رابردووی دوور : ئەم رابردووە لە گەڵ ڕیژەی رابردووی نزیك ڕۆدەنرێن. بە پێی وێنەی (١٩) رابردووی نزیك لە (بوون) بریتییە لە :

| | |
|---|---|
| بوو ( م ) ( - ) ( - ) | : هە ( م ) بوو (-) ( - ) ( - ) |
| بوو ( ت ) ( - ) | : هە ( ت ) بوو (-) ( - ) ( - ) |
| بوو ( ی ) ( - ) | : هە ( ی ) بوو (-) ( - ) ( - ) |
| بوو (مان) ( - ) | : هە (مان) بوو (-) ( - ) ( - ) |
| بوو (تان) ( - ) | : هە (تان ) بوو (-) ( - ) ( - ) |
| بوو (یان) ( - ) | : هە (یان ) بوو (-) ( - ) ( - ) |

وەك :

ناردبوو ( م ) ( - )

ناردبوو ( ت ) ( - )

ناردبوو ( ی ) ( - )

ناردبوو (مان ) ( - )

ناردبوو ( تان) ( - )

ناردبوو ( یان) ( - )

ئەم رستانە هەموو بەرکارێکی نادیار هەڵ دەگرن بەرامبەر بە کەسی سێیەمی تاك چونکە ڕێژەکەی (بوون) هەڵی دەگرێت بە نادیاری.

چوارەم - رابردووی تەواو : لە بەرئەوەی ئەم رابردووە وەك رابردووی دوور رۆدەنرێت بەلام گیانی ئێستایی هەلّ دەگرێت، بنجی (بوون) لە (بوو) دەبێتەوە بۆ ئەوەی (وو) بمێنێتەوە، پاشان لە خانەی [٧-] دا مۆرفیمی (ـە) زیندوو دەبێتەوە، وەك لەسەر وێنەی (٢٠) دەرخراوە.

بە ئەم چەشنە لە هەر چوار جۆرە رابردووەکەدا بە ناچاری و بە نادیاری کەسی سێیەمی تاك هەیە وەك (بەرکار) لە رابردووی تەواودا رەگەزی (ـە) هەرچەندە بریتی‌یە لە بارگەی خانەی [٧-] بەلام (بەرکار) نی‌یە و مۆرفیمی کاتی ئێستایی‌یە بۆ کەسی سێیەمی تاك بە تەنها. لە لایەکی ترەوە لە هەموو رابردووەکان دا بنەمای (بکەر پاشان بەرکار) چەسپاوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە رێژەی رابردوو رۆنراوە و ئەو بنەمایە لە (بوون) ەوە تووشی بووە. ئێستاش دەتوانین وێنەی (١٥) بگۆرین بۆ وێنەی (٢١) بۆ دیاری کردنی سنووری ئەو دوو بنەمایە لە رێژە تێپەرەکان دا.

وەکوو لە چەمکی ئەم بەشەدا دەرخرا سەرچاوەی بنەمای نادیاری لە جێناوی کەسی سێیەمی تاك دا دەگەرێتەوە بۆ رێژەکانی (بوون) لە دەمکاتی رانەبردوودا. ئەو بکەرە نادیارەی کە لە رێژەی (بوون) دا دەرکەوت بۆ کەسی سێیەمی تاك بە دوو رێگا دەفرۆشرێتەوە بە رێژەکانی رابردوو:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| - | وو | م | - | ـه | : ناردوو مه |
| - | وو | ت | - | ـه | : ناردوو ته |
| - | وو | ی | - | ـه | : ناردوو یه ـه‌تی |
| - | وو | مان | - | ـه | : ناردوو مانه |
| - | وو | تان | - | ـه | : ناردوو تانه |
| - | وو | یان | - | ـه | : ناردوو یانه |
| | | ٦- | ٧- | | |

وێنه‌ی (٢٠): ڕێژه‌ی ڕابردووی ته‌واو (تێپه‌ڕ).

| ڕانه‌بردوو | |
|---|---|
| کاره ئاساییه‌کان (ڕانه‌بردوی ساده) | بوون وهه‌بوون (ڕانه‌بردووی ته‌واو) |
| به‌رکار پاشان بکه‌ر | بکه‌ر پاشان به‌رکار |
| | ڕابردوو ی گشتی |

وێنه‌ی (٢١): گواستنه‌وه‌ی بنه‌مای (بکه‌ر پاشان به‌رکار)

بۆ ڕووبه‌ری ڕابردوو

٨٠
ڕێگای یەکەم - ڕێگای ڕاستەوخۆ (تێپەڕ) : لە ئەم ڕێگایەدا (بکەری نادیار)بە ڕاستەوخۆیی دەفرۆشرێتەوە بە هەر چوارڕابردووەکە. هەر لەبەر ئەوە هەموو ڕێژەیەکی ڕابردووی تێنەپەڕ گەر بتوانێت لە هەموو بکەرێك ڕزگار ببێت لە کەسی سێیەمی تاك ڕزگار نابێت. واتە هەر ڕێژەیەك جێناوی لکاوی هەڵ نەگرت ئەوا گیانی کەسی سێیەمی تاك هەڵدەگرێت وەك بکەرێکی نادیار.

ڕێگای دووەم- ڕێگای ناڕاستەوخۆ (تێپەڕ) : لە ئەم ڕێ ڕێگادا ڕێژەی تێنەپەڕی بوون (بۆ کەسی سێیەمی تاك) بە ئیزگەیەکی وەرچەرخێنەردا تێدەپەڕێت و گیانی (بکەر) دەکات بە بەرکارێکی نادیار و دەی بەخشێت بە هەر شەش کەسەکە لە
٨١
ڕێژەی وەرچەرخاوی بوون دا. لە ئێرەدا ئەو هەر شەش ڕێژەیەش ئەو بەرکارە نادیارە دەفرۆشنەوە بە ڕابردووی تێپەڕ. جا لەبەر ئەوە هەموو ڕێژەیەکی تێپەڕ لە ڕابردوودا گیانی بەرکاری کەسی سێیەمی تاك هەڵ دەگرێت و ڕێژەکە ناتوانێت دەرباز ببێت لێی.

ئەم دیاردە یە هەموو پانتایی دەمکاتی ڕابردوو دەگرێتەوە، لەسەد دا سەدئەوەی لە ئەم بەرەنجامەدا وترا لەسەر وێنەی (٢٢) دەرخراوە. ڕێچکە ڕاستەوخۆکە بریتی یە لە ڕێچکەی (أب) و ڕێچکەی ناڕاستەوخۆ بریتی یە لە ڕێچکەی (أجـ د). خاڵی (جـ) بریتی یە لە دیاردەی وەرچەرخان.




وێنەی (٢٢): ڕێچکەی گواستنەوەی (نادیاری جێناو)
لەکەسی سێیەمی تاك دا بۆ ڕووبەری ڕابردوو[٣١]

سەبارەت بە مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، ئەم رەگەزە هەر لە دوو رێژەدا دەردەکەوێت یەکەمیان رێژەی رانەبردوو لە (بوون)، واتە رێژەی رانەبردووی تەواو و دووەمیان رێژەی رابردووی تەواو. لە ئەم دوو رێژەیەدا کەسی سێیەمی تاك نادیارە و مۆرفیمی ئێستایی (ـە) لە جێی دانیشتووە. لە رێژە تێنەپەرەکان دا (ـە) لە جێی (بکەر) دەردەکەوێت و لە رێژە تێپەرەکان لە جێی (بەرکار) دادەنیشێت. ئەوەش لە یاد نەکەین کە لە هەردوو رێژەکەدا رەگەزی (ـە) هەر بریتی یە لە بارگەی خانەی [٧-] و[٨٢] هەر وەکوو جێناوەکە دەفرۆشرێتەوە لە رێژەیەکەوە بۆ رێژەیەکی تر.

جوانترین سەرنج لە ئەم بەشەدا بریتی‌یە لە ئەو بۆ چوونەی کە خانەی [٧-] دابەش دەکات بەسەر دوو ژێرخانەدا. ئەم بۆچوونە رەنگ زۆر شتی، لە پێشتردا، وتراو راست بکاتەوە.لەلایەکەی ترەوە، بابەتی نێو ئەم بەشە وهەردوو میکانیزمی (وەرچەرخان) و(رۆنانی رێژەی رابردوو) کراون بەشاکارێکی فراوان، لەبەرگی کتێبێك دا بەناوی (نەخشەی رۆنانی رێژە)،[٨٣] کە هێشتا بلاو نەکراوەتەوە.

## بەشی نۆیەم

## بەرەنجام

## لە ڕێزمانی بوون و هەبوون دا[٨٤]

وەکوو بەرەنجامێك بۆ ڕێزمانی بوون و هەبوون دەتوانین ئەم خاڵانەیخوارەوە تۆمار بکەین:

* ڕێزمانی (بوون و هەبوون) جودایە لە ڕێزمانی بوونی بوونایەتی و لە ڕێزمانی کردارە ئاسایییەکان. بەکورتی، ڕێزمانی ئەو دوو کردارە لە لایەکەوە وەك یەك وان و لەلایەکی ترەوە جیاوازن لە هەموو کرداری زمانەکە.

* کاری بوونی بوونایەتی هەر چەندە تێپەڕاندن بە (ێن) پەسەند ناکات بەڵام بە دوو ڕێگا دەبێت بە تێپەڕ، وەك (هەڵ بوون: هەڵ کردن) یان بەوەرچەرخان بەڵام بوون و هەبوون تەنها هەر بە وەرچەرخان دەبن بە تێپەڕ.

* بوونی بوونایەتی ریزێك لەڕێزە دەردەخات کە دەبن بە داپۆشەری ڕێژەکانی (بوون و هەبوون). ناسینەوە (تشخیص)ی ڕێژەکانی ئەو کردارە لە گوفتاردا دەبێت بە کەرستەیەکی بەکار بۆ جودا کردنەوەی ڕێژەکانی بوون وهەبوون.[٨٥]

* کاری [هەبوون]، لە جۆری سێیەم، پڕ بە پڕ یەکسانە بە [بوون] لە جۆری دووەم ئەگەر پارچۆڵکەی [هە] کرا بە سەربار. ئەرکی پارچۆڵکەی [هە] گۆڕینی واتای کاری بوونە. لە دیوی یەکەم دا واتای [ئارایی: Existence] دەبەخشێت و لە دیوی دووەم دا واتای [التملك: Pocession] دەبەخشێت.

* هەرسێ جۆرەکەی [بوون]، کە باس کران لە ناو ئەم نووسینەدا، ناتوانن بگۆڕی ناوەکی [ێن] وەربگرن و ناتوانن بەئەم کەرەستەیە ببن بە تێپەڕ، لە ئەنجامیش دا ناتوانن بگۆڕی نادیاری [ر] وەربگرن. بەئەم چەشنە دەتوانین بڵێین کە جۆرەکانی بوون مل کەچ نین نە بۆ [تێپەڕاندن] نە بۆ [بکەر نادیاری]. ئەم دیاردەیە وەك ئەندازە جودایان دەکاتەوە لە کارە ئاسایی یەکان.

* کاری هەبوون لە جۆری سێیەم، یەکەم کاری زمانەکەیە کە ە بەراورد لەگەڵ کارەکانی تردا، دەتوانێت جێ گۆڕکێی جێناو پیادە بکات لە رابردووی نزیك و تەواو و دووردا. ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە سەر دووپارچەیی کارەکە بەسایەی پارچۆڵکەی [هە]وە. ئەم کەرەستەیە وا لە هەبوونی تێپەڕ دەکات کە بە هیچ جۆرێك بێ جێ گۆڕکێ نەبێت.

* لەسەر پێوانی و کێشی کاری تێپەڕ [کەوتن]، لە رستەی وەرچەرخاودا جۆری یەکەم و دووەم و سێیەم وەردەچەرخێن بەئەم چەشنە:[٨٦]

کەوتن:

ئاسایی: (شتەکە) [___] (-) [دە] [کەو] (ێت)

وەرچەرخاو: من [شتەکە] (م) [دە] [کەو] (ێت)

بوونایەتی:

ئاسایی: (منداڵەکە) [___] (-) [ئە] [بـ] (ێت)

وەرچەرخاو: (شیرین) [منداڵەکە] (ی) [ئە] [بـ] (ێت)

بوون:

ئاسایی: (سەرما) [___] (-) [___] [___] (یـ) (ـە)

وەرچەرخاو: (من) [سەرما] (م) [___] [___] (-) (ـە)

هەبوون:

ئاسایی: (پارە) [___] (-) [هە] [___] (یـ) (ـە)

وەرچەرخاو: (من) [پارە] (م) [هە] [___] (یـ) (ـە)

لە ئەو رستانەدا [بکەر]ی رستەی ئاسایی بوو بە [جێگری بەرکار] لە وەرچەرخان دا وئەو [بکەر دەرەکی]یەش [من] بوو بە [جێگری بکەر] لە رستە ئاسایی یەکەدا.

* کاری [بوون] لە جۆری دووەم بچوکترین و وردترین رستە دەبەخشێت بە زمانەکە، وەك (منم، تۆیت، ئەوە، ئێمەین، ئێوەن ، ئەوانن). ئەم کردارە لە هەر لێکدانێك دا لەگەڵ [بکەر]، وەك [بەردە، ئازادبوو، چی یە؟....] یان لەگەڵ [بکەر و پاڵپشتەکەی]، وەك [بەردەکە سوورە، ئازاد مامۆستابوو، چی

خۆشه؟...]، کارێکی نوێ پەیدا دەکات و دەکەوێتە بەر مەکینەی زمانەکە پڕ بە پڕ وەك کاری (بوون).[٨٧]

* وا دەردەکەوێت کە [بوون] بتوانێت تێپەڕ و تێنەپەڕ پیادە بکات لە بنجەوە. لەوانەیە ئەم بۆ چوونە پەی بردبێت بەرکاری یاریدەدەری ژمارە [یەك] لە زمانەکەدا، بەتایبەتی کاتێك کە بێ پێشکار و بێ پاڵپشت بەکار دەهێنرێت، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| من (-) (م) | تۆ (-) (یت) | ئەو (-) (ە) |
| ئێمە (-) (ین) | ئێوە (-) (ن) | ئەوان (-) (ن) |

بۆ نموونەئەگەر وەرنەچەرخا ئەم روخسارانە دەبەخشێت:[٨٨]

| | | |
|---|---|---|
| من (-) (م): | من [سارد] (م): | من [کەوتوو] (م) |
| ئێمە (-) (ین): | ئێمە [سارد] (ین): | ئێمە [کەوتوو] (ین) |
| ئەو (-) (ە): | ئەو [سارد] (ە): | ئەو [کەوتوو] (ە) |
| ئەوان (-) (ن): | ئەوان [سارد] (ن): | ئەوان [کەوتوو] (ن) |

* پارچۆلکەی [هە] کە دەخرێتە سەر [بوون] بۆ دروست کردنی [هەبوون: جۆری سێیەم]، رەفتارێکی زۆر سەیر دەنوێنێت لە ریزی رستەدا و بە ئەم چەشنە:

١- ئەگەر پێشکاری [دە] هات ئەوا [هە] لە ناو دەچێت وکپ دەبێت. ئەم یاردەیە تەنها لە رابردووی بەردەوام دا دەردەکەوێت، چونکە هەر لە لەوێ دا پێشکاری [دە] هەیە.

٢- ئەگەر پێشکاری [نەری] هات ئەوا کپ دەبێت وەك خاڵی یەکەم. ئەگەر [نە] و [دە] یش هەبوون بە یەکەوە، هەر کپ دەبێت.

٣- ئەگەر [نە] و [دە] نەبوون ئەوا زیندوو دەبێتەوە و ئەگەر بە زۆرداری یش لابرا ئەوا [بوون] ە کە دەبێت بە جۆری دووەم ورێژەی‌کەش لێل دەبێت.[٨٩]

• تەنها لە کەسی سێیەم دا، جۆری دووەم و سێیەم لە [بوون] روخساری جێناو دەگۆڕێت لە [ێت] ەوە بۆ [ـە] لە رانەبردودا. ئەم رەگەزە تازەیە پیتێکی کپ لە چەشنی [ت] هەڵ دەگرێت و لە ئاوێتە بوونی بزوێن دا دەردەکەوێتەوە. هەر لەبەر ئەوە دەبێت روخسارد رەسەنەکەی [ـەت] بێت. لەوەش لە یاد نەکەین کە لە هەموو جێناوە لکاوەکان دا پیتی [ت] بەرەو کپ بوون دەڕوات لە گوفتاردا.[٩٠]

• جۆری دووەم و سێیەم لە [بوون] تەنها کاری زمانەکەن کە روخساری بنجەکەیان دەگۆڕێت بە پێی نیاز و گومان لە رستەی رانەبردوودا. ئەم دوو کارە بنجەکەیان دەبێت بە نادیار لە رانەبردووی رستەی ئاشکرادا.

• لە رابردووی تەواودا، لە جیاتی بارگەی [بوو] لە خانەی رابردووی دووردا بارگەی [و] دەردەکەوێت و بزوێنی [ـە] کپ نابێت و دەمێنێتەوە لە گوفتاردا بۆ جیاوازی لە جۆرەکانی تر لە رابردوو.

* پارچۆڵکەی رابردووی دوور [بوو] و پارچۆڵکەی رابردووی تەواو [و] یەك خانەیان هەیە و هەر یەکێکیان دەتوانن هەبن لە یەك رستەدا [بوو] یان [و]. ئەم دوو رابردووە بە واتا لە رابردووی نزیك و بەردەوام دوورترن و کاتی روودانیان لە دوورتر دەچێت. سەرەڕای ئەمە هەموو رابردوویەکی دوور دوو پیتی رابردوو هەڵ دەگرێت، یەکەمیان هی کارەکە خۆی دووەمیان هی [بوون]، وەك:

من کەو [ت] ب [وو] م

من نارد [د] ب [وو] م

رابردووی تەواویش دەبێت هەر ئاوهابێت:

من کەو [ت] (-) [وو] م

من نار [د] (-) [وو] مە

* لە رابردووی تەواو دا واتای تەواو بوونی رووداوەکە هەیە و گیانی [ئێستایی]یش هەر هەیە. لە ئەم رابردووەدا دوونیشانەی رابردوو گیانی دوورایەتی و تەواو بوونی رووداوەکە دەبەخشێت بەلاّم کپ بوونی پیتی [ب] گیانی [ئێستایی] دەکاتە بەر رستەکە. ئەم گیانی [ئێستایی]یە لە رانەبردووش دا کە بنجی [ب] کپە ورەگەکەی نادیارە هەر هەیە و واتای [ئایندەیی]یش لە ناو دەبات.

* جۆری یەکەم بە جوانی پێشکاری بەردەوامی [دە] وەردەگرێت کەچی ئەم کەرەستەیە لە جۆری دووەم و سێیەم دا نییە، مەگەر هەر لە رابردووی بەردەوام دا. بەلاّم کاتێك پێشکاری [نەریَ] هات رستەکە ئاڵۆزتر دەبێت، وەك:

جۆری یەکەم: من [نە] [دە] [بـ] م ــــ من [نا] [بـ] م

جۆری دووەم: من [نە] [ـ] [ـ] م ــــ من [نی] م

جۆری سێیەم: من [نە] [هە] [ـ] م ــــ من [نی] م

لێرەدا روخساری جۆری دووەم و سێیەم تێکەڵ بوو لە [نەریَ]دا، وەك:

من هە ــــ م

من [نی] م

من ــــ ــــ م

ئەگەر [نە + هە = نی] لە [من نە هە م]دا، ئەی بۆچی لە دووەم دا، [نە + ــــ = نی]، یەکسان نەبوو بە [نە]. ئەم دیاردەیە شوێنەواری پێشکارێکی نادیار، یان نەماو لە رستەی [من ــــ م]دا دەست نیشان دەکات.

* لە رووی واتاوە هەر سێ جۆرەکەی بوون لە یەکتری جیاوازن، بۆ نموونە:

[ئاوێتە ن]

ئاوێتەبوون

[ئاوێتە دەبن]

له رابردوودا ئەم دوو رستەیە دەبنەوە بەیەك بە روخسار بەلام له رانەبردوودا رستەی [ئاوێنە ن] واتای رابردووی تەواو دەبەخشێت بەلام [ئاوێتەی دەبن] واتای رانەبردوویی و داهاتوویی دەبەخشێت.[91]

* یەکێك له بەرەنجامە هەرە گرنگەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتی‌یە له رێزمانی کرداری [هەبوون]. ئەو [هەبوون]ەی کە گلۆلەیەکی بێ سەر بوو و نەدەدرا له تەونی رێزمان. له بەرەنجامی ئەم باسەدا زۆر بە نایابی دەزانین کە هەموو رێژەکانی ئەم کردارە له خشتەیەک دا کۆ بکەینەوە (خشتە ٢٦).

لەئەم خشتەیەدا چەند خاڵێك دیاری دەکرێن. وەك:

١- له هیچ رێژەیەك دا [هەبوون] بێ پێشکاری [هە] نی‌یە تەنها له رابردووی بەردەوام دا نەبێت. ئەویش بۆ ئەوەی رابردووی نزیك و بەردەوام له یەکتری جوودا بکرێنەوە.

٢- دەرنەکەوتنی [هە] له رابردووی بەردەوام دا، رەنگە بۆ ئەوە بێت کە [هە] و [دە] هەردوویان هاو هێزبن و جێگەیان خانەی بەردەوامی بێت.

٣- ستوونی جێناو له رانەبردوو و رابردوو دا هەر یەکە لەیەك شوێنە چونکە [هەبوون] کردارێکی وەرچەرخاوەو چووەتە سەر رەفتاری رابردووی تێ پەڕ له رانەبردوو و رابردوودا.

٤- دەرکەوتنی پارچۆڵکەی نیاز [با] و پارچۆڵکەی گومان [بێت].[92]

ئەم دوو پارچۆڵکەیە دوو گلۆپی سەوزن له دەروازەی زمانەکە دا بۆ رستەی نیاز و رستەی گومان.

٥- [هەبوون] ڕێـژەی فرمـانی نی‌یـه وەك هـەموو کردارێکـی وەرچەرخاو لە زمانەکەدا.

* کرداری [بوون] لە جۆری یەکەم دا چەند ڕەفتارێکی هەیە کە لە جۆری دووەم و سێیەم جود ای دەکاتەوە وەك:

١- پاشـگری دووپـات کردنـەوە [ەوە]وەر دەگرێـت وەك هـەموو کردارەکانی زمانەکە.

٢- ئامرازی پەیوەندی وەر دەگرێت وەك [بوون بە مامۆستا، یان بوونە مامۆستا] ئەم ئامرازە ناچێتە سەر جۆری دووەم و سێیەم. کرداری [بوون بە] بە هیچ جۆرێك وەرناچەرخێت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە [بوون بە] دیوێکی تازە، یان جۆرێکی تازەیە لە کرداری بوون.

٣- پێشکاری بەردەوامی [دە] وەر دەگرێت زۆر بە ئاسـایی و [دە] ئاوێتـە دەبێـت لەگـەڵ [نـە] و دەبێـت بـە [نـا] وەك هـەموو کـردارە ئاسایی‌یەکان.

٤- هەرچەندە پارچۆڵکەی تێپەڕاندن [ێن] وەر ناگرێت بەڵام ئەگەر هێزی تێپەڕین هات وا دەگۆڕێت بۆ [کردن].[٩٣]

* ئـەم لێکۆڵینەوەیـە، ڕەنگـە دەرگـا لـە چەندین پارچۆڵکـە و گـەردیلـەی نێـو ڕێزمـان بکاتەوە بـە تایەبـەتی ئەوکەرەستانـەی بەروخسـار لـە ڕێژەی‌کـانی کرداری [بوون] دەچن، وەك: [با]ی داخوازی وەك [بابڕۆین]. یان کرداری ناتەواوی [دەبا، دەبێت]، وەك [دەبێت[٩٤]، ببێت].

* گەورەترین کەلکی ئەم نووسینە ئەوەیە کە دەتوانین هەموو ڕیزە چالاکەکانی کرداری [بوون]. هەر سێ جۆرەکەی و هەر شەش دیوەکەی، خشتە ڕیز بکەین. خشتەی (٢٦) دیوەکانی یەکەم یەکلایی دەکاتەوە و خشتەی (٢٧) دیوەکانی دووەم. لە ئەو خشتانەدا ڕاستی‌یەک دەردەکەوێت کە ئەوەیە: [هەر ڕستەیەك (ڕستەی ئاشکرا) دەتوانێت ببێت بە (ڕستەی نیاز) یان (ڕستەی گومان)]. ئەمە ئەو بیر و بۆ چوونە دادەژەنێت کە ڕستەی گومان و نیاز بەیەك جۆر (انشائی) دادەنێت، بەڵام کورد دەڵێت:

بێ‌گومان ئازاد رویشت، [ڕستەی ئاشکرا]

خۆزگا ئازاد رویشت با، [ڕستەی نیاز]

رەنگە ئازاد رویشت بێت، [ڕستەی گومان].

* لە روانگەی بابەتی نێو ئەم کتێبەوە دەتوانین پۆلین کردنێکی نوێ بۆ کار پێشنیاز بکەین. سەبارەت بە بوون و هەبوون دوو ڕۆڵی گرنگ، وەك دوو دیاردەی زمانەوانی، دەرخران. ئەو دوو دیاردەیە بریتی بوون لە [دیاردەی وەرچەرخان] و [دیاردەی یاریدەدان]. ئێستاش دەتوانین ئەو کارانەی کە پاك و بێ‌گەردن لە دیاردەی یاریدەدان ناو بنێین [چینی بنەڕت] یان [ڕێزەی بنەڕت]. ئەم ڕێزە بنەڕەتی‌یە بریتی‌یە لە یەکەم مووری زمانی کوردی و لەسەر ئەو موورە زمانەکە ڕۆ دەنرێت و گوفتار دەسازێت لەگەڵ ڕووداودا. بە کورتی دەتوانین بڵێین کە ئەم ڕێزانە دەتوانن جێی کار بکەنەوە لە زمانەکەدا، بەئەم چەشنە:

١- ڕێزەی بنەڕت: لە ڕانەبردوودا

| جۆر | | ئاشکرا | | | نیازداری | | | | گومانداری | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| جۆری یەکەم (بووبایەتی) | من | دە | بـ | م | من | بـ | بـ | م | من | بـ | بـ | م |
| | تۆ | دە | بـ | یت | تۆ | بـ | بـ | یت | تۆ | بـ | بـ | یت |
| | ئەو | دە | بـ | ێت | ئەو | بـ | بـ | ێت | ئەو | بـ | بـ | ێت |
| | ئێمە | دە | بـ | ین | ئێمە | بـ | بـ | ین | ئێمە | بـ | بـ | ین |
| | ئێوە | دە | بـ | ن | ئێوە | بـ | بـ | ن | ئێوە | بـ | بـ | ن |
| | ئەوان | دە | بـ | ن | ئەوان | بـ | بـ | ن | ئەوان | بـ | بـ | ن |
| جۆری دووەم (بوون) | من | — | — | م | من | — | با | م | من | — | بـ | م |
| | تۆ | — | — | یت | تۆ | — | با | یت | تۆ | — | بـ | یت |
| | ئەو | — | — | ە | ئەو | — | با | — | ئەو | — | بـ | ێت |
| | ئێمە | — | — | ین | ئێمە | — | با | ین | ئێمە | — | بـ | ین |
| | ئێوە | — | — | ن | ئێوە | — | با | ن | ئێوە | — | بـ | ن |
| | ئەوان | — | — | ن | ئەوان | — | با | ن | ئەوان | — | بـ | ن |
| جۆری سێیەم (هەبوون) | من | هە | — | م | من | هە | با | م | من | هە | بـ | م |
| | تۆ | هە | — | یت | تۆ | هە | با | یت | تۆ | هە | بـ | یت |
| | ئەو | هە | — | یە | ئەو | هە | با | — | ئەو | هە | بـ | ێت |
| | ئێمە | هە | — | ین | ئێمە | هە | با | ین | ئێمە | هە | بـ | ین |
| | ئێوە | هە | — | ن | ئێوە | هە | با | ن | ئێوە | هە | بـ | ن |
| | ئەوان | هە | — | ن | ئەوان | دە | با | ن | ئەوان | هە | بـ | ن |
| ژمارەی خانە | ٦- | ١- | ٠ | ٧- | ٦- | ١- | ٠ | ٧- | ٦- | ١- | ٠ | ٧- |

خشتەی (٢٦) دیوی (تێنەپەڕ) لەجۆرەکانی (بوون).

| جۆر | | ئاشکرا | | | | نیازداری | | | | گومانداری | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| جۆری یەکەم (بوونایەتی) | من | ده | م | ب | ێت | ب | م | ب | ێت | ب | م | ب | ێت |
| | تۆ | ده | ت | ب | ێت | ب | ت | ب | ێت | ب | ت | ب | ێت |
| | ئەو | ده | ی | ب | ێت | ب | ی | ب | ێت | ب | ی | ب | ێت |
| | ئێمە | ده | مان | ب | ێت | ب | مان | ب | ێت | ب | مان | ب | ێت |
| | ئێوە | ده | تان | ب | ێت | ب | تان | ب | ێت | ب | تان | ب | ێت |
| | ئەوان | ده | یان | ب | ێت | ب | یان | ب | ێت | ب | یان | ب | ێت |
| جۆری دووەم (بوون) | من | — | م | — | ـه | — | م | با | — | — | م | ب | ێت |
| | تۆ | — | ت | — | ـه | — | ت | با | — | — | ت | ب | ێت |
| | ئەو | — | ی | — | ـه | — | ی | با | — | — | ی | ب | ێت |
| | ئێمە | — | مان | — | ـه | — | مان | با | — | — | مان | ب | ێت |
| | ئێوە | — | تان | — | ـه | — | تان | با | — | — | تان | ب | ێت |
| | ئەوان | — | یان | — | ـه | — | یان | با | — | — | یان | ب | ێت |
| جۆری سێیەم (هەبوون) | من | هه | م | — | ـه | هه | م | با | — | هه | م | ب | ێت |
| | تۆ | هه | ت | — | ـه | هه | ت | با | — | هه | ت | ب | ێت |
| | ئەو | هه | ی | — | ـه | هه | ی | با | — | هه | ی | ب | ێت |
| | ئێمە | هه | مان | — | ـه | هه | مان | با | — | هه | مان | ب | ێت |
| | ئێوە | هه | تان | — | ـه | هه | تان | با | — | هه | تان | ب | ێت |
| | ئەوان | هه | یان | — | ـه | هه | یان | با | — | هه | یان | ب | ێت |
| ژمارەی خانە | +٦ | +١ | -٦ | ٠ | -٧ | +١ | -٦ | ٠ | -٧ | +١ | -٦ | ٠ | -٧ |

خشتەی (٢٧)، دیوی (تێپەر) لەجۆرەکانی (بوون).

یەکەم: هەموو ڕێژەکانی ڕانەبردووی کاری تێپەڕ و تێنەپەڕی ئاسایی، ئەم کردارانە ئەم ڕیزە جێناوانە وەردەگرن بۆ بکەر و بۆ بەرکار (خشتەی ٢٨). لە ئێرەدا کە ئەم ڕێژەیە بنەڕەت بێت دەبێت ئەو دوو ستوونە جێناوەش جێناوی بنەڕەت بن. واتە بە ڕوخسار و بە ئەرك و بە رەفتار بنەڕەت بن. ئەرك و ڕوخسار ئاشکرایە لەسەر خشتەکە و بۆ رەفتار ستوونی بکەر جێ گۆڕکێ ناکات و ستوونی بەرکار جێ گۆڕکێ دەکات.

دووەم: ڕێژەکانی ڕانەبردووی بوونی تێنەپەڕ و هەبوونی تێنەپەڕ، بۆ بکەر [م، یت، ـە، ین، ن، ن] تەنها بۆکەسی سێیەمی [ێت] دەگۆڕێت بە [ـە].

٢-ڕێژەی وەرچەرخاو: بوون وهەبوونی تێنەپەڕ بە وەرچەرخان دەبن بە تێپەڕ. لە وەرچەرخان دا ئەرك گۆڕکێ دروست دەبێت و ئەوەی لە ڕێژەی بنەڕەت دا بکەرە دەبێت بە بەرکار و ئەوی لە بنەڕەت دا بەرکارە دەبێت بە بکەر. واتە جێناوی بکەر و بەرکار ئەرك دەگۆڕنەوە، (خشتەی ٢٩)

٣- ڕێژەی پاریدەدراو: هەموو ڕابردووەکان بۆ کاری تێنەپەڕی ئاسایی و بوون و هەبوون(تێنەپەڕ)لەگەڵ ڕێژەی بنەڕەتی [بوون]دا ڕۆ دەنرێن.

٤- ڕێژە پاریدەدراو و وەرچەرخاو: هەموو ڕابردووی تێپەڕی ئاسایی و بوون و هەبوونی تێپەڕ، بە پاریدەدانی خاڵی (٢) دروست دەبن پڕ بە پڕ وەك لەسەر خشتەکە بە وەرچەرخاوی جێناوەکان ڕیز کراون.

| کەس | بکەر [-١] (جێ نەگۆڕ) | بەرکار [-٦] (جێ گۆڕ) |
|---|---|---|
| من | م | م |
| تۆ | یت | ت |
| ئەو | ێت | ی |
| ئێمە | ین | مان |
| ئێوە | ن | تان |
| ئەوان | ن | یان |

خشتەی (٢٨) :جێناوی بنەڕەت وئەرکی بنەڕەت.

| کەس | بکەر [-٦] (جێگۆڕ) | بەرکار [-٧] (جێ نەگۆڕ) |
|---|---|---|
| من | م | م |
| تۆ | ت | یت |
| ئەو | ی | (ە) |
| ئێمە | مان | ین |
| ئێوە | تان | ن |
| ئەوان | یان | ن |

خشتەی (٢٩) :جێناوی بنەڕەتی وەرجەرخاو.

* مۆرفیمی ئێستایی (ـە) رەگەزێکە (تەواوێتی) لەرووداودا دەردەخات.
ئەم مۆرفیمە جێناو نی یە وجێگری جێناوە وتەنها لەرووبەری رانەبردوو تەواو ورابردووی تەواودا دەردەکەوێت. ئەویش بەمەرجێك کە جێناوی لکاوی داپۆشەر نەبێت لەرێژەکەدا.

* رەگەزی ئێستایی (ـە) خانەی جێنەگۆڕ [7-] دابەش دەکات بۆ دوو ژێر خانە وبەئەم کردەوەیە دەرگایەکی نوێ دەکاتەوە بۆ رێزمانی جێناوی لکاو.[٩٥] ئەم بابەتەی دوایی بریتی یە لە کتێبێك کە لەداهاتوودا بلاو دەکرێتەوە.

* جێناوی کەسی سێیەمی تاك (ی) لەرێژەی (هەیەتی)دا یاخی دەبێت لەبنەمای (بکەر پاشان بەرکار). بەئەم کردەوەیە ناسازی یەکی گەورە لەچەشنی (ڤایرۆس) دەخاتە نێو رستە سازی یەوە بەلام لەهەل ومەرجێکی زۆر زۆر ورد وتەسك دا. ئەم دیاردە ڤایرۆسی یە بەپردی (میکانیزمی رۆنان ) دەپەڕێتەوە بۆ (رووبەری رابردوو) ولەئەوێش دا ئاژاوە دەنێتەوە.ئەم ناسازی یە بەئەوە چار دەکرێت کەبەردەبازێك پەیدا بکرێت بۆ جێناوی (ی) بۆ ئەوەی بازێك بدات و وازبهێنێن لەیاخی بوون لەبنەمای (بکەر پاشان بەرکار). لەلایەکی ترەوە، ئەم ناسازی یە وای کردووە کەرووبەرێکی بێ گەرد لەرێژەی رابردوو بلەوتێت بەئەو ڤایرۆسە.

بەشی هەشتەم لەئەم نووسینەدا باشترین دەستەبەرەیە بۆ پەرێنەوە بۆ هەندێك دیاردەی ئالۆز و (بففە)و ناسك لەزمانەکەدا، وەك:

١- پەرِینەوە بۆ رێزمـانی کەسی سێیەمی تـاك کـەئاڵۆزترین کەسـە لـەنێو هەر شەش کەسەکەدا.

٢- دۆزینەوەی سەرەداوی نادیاری لەکەسی سێیەمی تاك دا کەگلۆڵەیەکی ئاڵۆسکاوە لەرووبەری زمانەکەدا.

٣- دۆزینەوەی سەرەداوی مۆرفیمی ئێستایی کە لـەجێی جێناوی نادیـار دادەنیشێت لەخانەی [7-]دا لەرووبەری زمانەکەدا.

٤- پەی بردن بە رێزمانی جێناو وبەپۆلێن کردنێکی تازە بۆ جێناو.

٥- پەیبردن بەجۆرەکانی رێژە و بە(پۆلێن کردنی رێژە) لەزمانەکەدا.

* میکـانیزمی وەرچـەرخان یەکێکـە لەمۆرکـــە رەسـەنەکانی زمانەکـە. دەربارەی ئەم دیاردەیە چەند خاڵێك هەیە بۆ دیاری کردن، وەك:

١- ئـەم میکانیزمـە لـەرێژەی بنـەرِەت دا روودەدات و بـەدیاری کـراوی لەرێژەی رانەبردووی تەواودا ولەکاری (بوون)دا.

٢- ئـەو دیاردەیـە وەك لەرانـەبردووی تـەواودا روودەدات بـە (میکـانیزمی رۆنان)لە رووبەری رابردوودا بلاّو دەبێتەوە.

٣- لەئەو میکانیزمەدا ئەرکی بنەرِەتی بۆ لەجێناوی بنەرِەتی (م، یت، ێت، ین، ن، ن)لە بکەرەوە دەگۆرِێت بۆ (بەرکار). پاشان ئەرکی بنەرِەتی بۆ لەجێناوی بنەرِەتی (م، ت، ی، مان، تان، یان) لەبەرکارەوە دەگۆرێت بۆ بکەر. بەواتایەکیتر بنەمای (بەرکار پاشان بکەر) وەردەچەرخێت بۆ (بکەر پاشان بەرکار).

٤- لەمیکانیزمی وەرچەرخان دا دووکرداری پێویست پەیدا دەبن کەبریتین لەبوونی وەرچەرخاو (تێپەڕ) وهەبوونی وەرچەرخاو (تێپەڕ). ئەم دووکارە، بەتایبەتی هەبوون، کەلێنێکی گەورە پردەکەنەوە لەزمانەکەدا.

٥- میکانیزمی وەرچەرخان دەرگایەك دەکاتەوە بۆ وەرچەرخاندنی کرداری تێنەپەر بۆ تێپەڕ بەپێی پێویستی زمانەکە.

٦- میکانیزمی وەرچەرخان باشترین کەرەستەیە بۆ هەڵ هێنانی مەتەڵە رێزمانی یەکان. بۆ نموونە بۆ کردارێکی وەرچەرخاو وەك (ویستن) لەرانەبردوودا، ئەو کەرەستەیە بەکارێتی خۆی دەردەخات. تۆبڵێیت ئەو کارە لەرەسەن دا (تێنەپەڕ) نەبێت وەك (کەوتن). ئەم بۆچوونە پێویستی هەیە بەلێکۆڵینەوە بۆ هەڵدانەوەی چاڵە داپۆشراوەکان.[٩٦]

* میکانیزمی رۆنانی رێژەی رابردو یەکێکە لەمۆرکە رەسەنەکانی زمانەکە. دەربارەی ئەم دیارەدەیە چەند خاڵێك هەیە بۆ دیاری کردن.

١- ئەم میکانیزمە رێژەکانی رابردووی تەواوی (بوون) ئەنجامی دەدات و لە(رووبەری رابردوو)دا بڵاو دەبێتەوە.[٩١]

٢- لەئەم میکانیزمەدا جێناوەکە بریتی یە لەبەشێك لە(رێژەی بوون). واتە کەس وژمارە لەگەڵ رێژەی (بوون) دەگونجێن نەك لەگەڵ رێژەی رابردووی کارەکەدا.

٣- ئەم دیارەدەیە هیچ ناگۆرێت لەروخسارو لەئەرکی جێناو. ئەو جێناوەی لەرانەبردووی تەواودا بکەرە هەر بەبکەری دەمێنێتەوە ئەوەی بەرکارە هەر بەبەرکاری دەمێنێتەوە.[٩٧]

٤- لەئەم میکانیزمەدا دوو رێچکەی رستەسازیانە هەن. یەکەمیان رێچکە
رۆنانی رێژەی تێنەپەڕ بەرێژەی بوونی وەرنەچەرخاو ودووەم
رێچکەی رۆنانی رێژەی تێپەڕ بەرێژەی بوونی وەرچەرخاو.

٥- ئەم میکانیزمە پردێکی والایە بۆ پەڕینەوەی سیماکانی رێ
رانەبردوو (بوون وهەبوون) بۆ رووبەری رابردوو. لەئ
پەرینەوەیەدا (دروست) و(نادروست) ڤیزەیان هەیەوزۆر س
بیژۆکەکانی (بوون وهەبوون) بەنارەوایی دەلکێن بەرێ
رابردووەوە.[٩٨]

* میکانیزمی وەرچەرخان ومیکانیزمی رۆنان دوو کەرەستەی بەکار
شیتەڵکاری زانستییانە لەزمانەکەدا. ئەم دوو دیاردەیە رەنگە بتو
دەرگای رێبازێکی نوێ بکەنەوە لەرێزمانەکەدا.

* میکانیزمی وەرچەرخان، رەنگە بابەتێکی نوێ بێت بەلام (میکانی
رۆنان) هەرچەندە نوێ بێت کەچی جێدەست وئاسەواری دە
بەرێژەی رابردووەوە لە زمانانی تردا. تۆ بڵێیت ئەو میکانیزمە لە
زمانانەدا نەبێت. ئەوەیش پێویستی هەیە بە لێکۆلینەوە.

* لە هەموو ئەوەدا کە باس کرا بابەتێکی نوێ پەیدا دەبێت لە ژێر نا
دابڕین (فرز). ئەم بابەتە دەبێت ئەم خالانە روون بکاتەوە:

١- دابڕین لە نێوان هەر سێجۆرەکەی (بوون)دا.

٢- دابرین لە نێوان دیوی ئاسایی و دیوی وەرچەرخاودا.

٣- دابڕینی (بوونی بوونایەتی) لەگەڵ رووبەری رانەبردووی سادەدا.

٤- دابڕینی دەمکاتی ڕانەبردووی سادە ودەمکاتی ڕانەبردووی تەواو.

٥- دابڕینی ڕووبەری ڕانەبردووی تەواو بەسەر دوو کاردا، (بوون) و (هەبوون).

٦- وەك (هەبوون) بارێکی تایبەتی یە لە (بوون)، دەبێت ڕووبەری (ڕانەبردووی تەواو) دابڕرێت بەسەر یەك کاردا کە بریتی یە لە (بوون).

٧- بەپێی ئەو شەش خاڵەی پێشەوە دەبێت ئەم کتێبە لەسەر ڕێزمانی (بوون) دانرابێت. واتە (بوونی بوونایەتی) و (هەبوون) دەستەبەرەن بۆ لێکۆڵینەوەکە.

٨- بەپێی ئەو حەوت خاڵەی سەرەوە دەبێت کەسێك کە ڕێزمانی (بوون) تێگەیشتبێت، بتوانێت ڕێزە وردوبزێوەکانی (بوون) ببینێتەوە وبناسێتەوە لە نێو تەونی ڕستەدا.[٩٩]

لەکۆتاییدا، دەڵێین: ئەمە بو ڕێزمانی (بوون و هەبوون) کە بریتی یە لە هەنگاوی سەرەتایی لە ڕستەورستەسازی. ئەمەیش بوو میکانیزمە بنەڕەتەکانی (ڕستەسازی). ئەمە بوو وانەکانی (ڕستەسازی) بۆ کۆرسی دووەمی ١٩٩٥-١٩٩٦ بۆ فێرخوازانی دکتۆرای زمانی کوردی. ئێستاش فێرخوازانی دکتۆراە (مامۆستایان، فەتاح مامە، یوسف شریف، طالب حسین، فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی، تارا عبداللّه) ئەم بیرو بۆچوونانە هەڵ دەگرن. ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە ڕێبازی ئەم توێژینەوە دەکەین بەکەرەستە و دەی چەسپێنین لە نووسینەکانی داهاتوودا.[١٠٠]

# سەرچاوەکان

هەرچەند ڕێبازی ئەم نووسینە زۆر جیاوازە لەئەم سەرچاوانەی کەلەئێرەدا تۆمار کراون، بەڵام کەڵکی ناراستەوخۆ، یان کەڵکی نوختەیی وەرگیراوە لێیان. بەشێوەیەکی گشتی ئەوسەرچاوانە بۆتێگەیشتن لەمیکانیزمەکانی زمان و تێگەیشتن لەڕێزمانی نووسراوی کوردی بەکار هێنراون. پاشان ئێمەیش وەکوو ئەندازیارێك لەنێو ئەو رەگەزە ڕێزمانییانەدا جێی خۆمان کردووەتەوە وڕێبازی کتێبی (ڕستەسازی وشیتەڵکاری) مان چەسپاندوە بەسەریاندا. ئەمەش لیستی ئەو سەرچاوانەیە کەکەڵکیان هەبووە لەئێشەکەدا:

## ١- بەزمانی کوردی:


١- د.شێرکۆ بابان، ڕستەسازی وشیتەڵکاری زانستی، هەولێر ١٩٩٦.

٢- د.شێرکۆ بابان، جێگۆڕکێی جێناوی لکاو، ڕۆڵی بکەر وبەرکار. گۆڤاری کاروان، ژمارە (٢)، ساڵی ١٩٩٢.

٣- د.نەسرین فەخری، وەستانێك لەئاستی هەردوو فەرمانی (بوون) و(هەبوون) و(هە) و(هی)دا، لێکۆڵینەوە وبەراوردی، کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، بەرگی ٢٣و٢٤ بەغدا ١٩٩٢.

٤- نووری عەلی ئەمین، چاوگی بوون وهەبوون لەزمانی کوردیدا، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٠٩) ساڵی ١٩٨٦.

٥- عومەر دزەیی، بەراورد کردنی ڕابردووی تەواوی کوردی لەگەڵ پێرفێکت، لەزمانە ئەوروپایی یەکان دا.

٦- مەسعوود محەمەد، سوورێکی خامە بەدەوری ڕاناودا، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٤.

٧- موسعوود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦.

٨- ڕەئووف ئەحمەد ئالانی، کاری هەبوون، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٢٩)، ساڵی ١٩٨٥.

٩- ڕەئووف ئەحمەد ئالانی، گەردانی بوون، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (٨٠)، ساڵی ١٩٨٠.

١٠- مەحموود فەتحولا، کار تەواو کردن لە کوردیدا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین تەمووزی ١٩٨٨ .

١١- وریا عومەر ئەمین، ڕێزمانی ڕاناوی لکاو، بەغدا ١٩٨٦.

١٢- نووری عەلی ئەمین، ئەرك وشوێنی ڕاناوە کەسییەکان لەئاخاوتنی کوردیدا، بەغدا ١٩٨٧.

١٣ محەمە ئەمین هەورامانی، فیلۆلۆژیای زمانی کوردی، بەغدا ١٩٧٤.
١٤- د. نەسرین فەخری ود. کوردستان موکریانی، رێزمانی کوردی بۆپۆلی یەکەم لەبەشی زمانی کوردی، زانکۆی سەلاحەدین هەولێر ١٩٨٢.
١٥- مەسعوود محەمەد، ورد بوونەوە لەچەند باسێکی رێزمانی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٤. (لاپەرە ١-٦١).
١٦- محەمەد مەعرووف فەتاح، زمانەوانەی، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ١٩٨٧.
١٧- جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوری، ئەڵمانیا ١٩٧٦.
١٨ لیژنەی زمان وزانستەکانی، رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦.
١٩- نووری عەلی ئەمین، دەوری بزوێی (ـە) لە زمانی کوردیدا، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١)سالی ١٩٨٦.
٢٠- د. ئەورەحمان حاجی مارف، وشەی زمانی کوردی، بەغدا ١٩٧٥.
٢١- رەئووف ئەحمەد نالانی، لە رواتگەی زمانەوانی یەوە (تێدا)، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (٧٥) سالی ١٩٧٩.
٢٢- د. ئەورەحمان حاجی مارف، رێزمانی کوردی بەشی دووەم، جێناو، بەغدا ١٩٨٧.
٢٣- د. جەمال نەبەز، رەخنەی زمانەوانی ولیسی کوێرانە هاوێشتن، گۆڤاری ئاسۆی زانکۆیی ژمارە (٩) سالی ١٩٨٧.
٢٤- وریا عومەر ئەمین، بیرکاری لەزمان دا رۆشنبیری نوێ ژمارە (١١٣) سالی ١٩٨٧.
٢٥- محەمەد مەعرووف فەتاح، کار پۆلین کردن بەپێی رۆنان، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢١) سالی ١٩٨٩.
٢٦- توفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، بەغدا ١٩٢٩.
٢٧ سەعید سیدقی کابان، مختصر صرف ونحوی کوردی، بەغدا ١٩٢٨.
٢٨- وریا عومەر ئەمین، مردنی وشە، گۆڤاری کاروان ژمارە (٤٥)، سالی ١٩٨٩.
٢٩- غازی فاتح ویس، جیاوازی نێوان مۆرفیم ووشە، گۆڤاری کاروان ژمارە (٣٨)، سالی ١٩٨٥.
٣٠- وریا عومەر ئەمین، لێکدانی وشەکان، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٨)، سالی ١٩٨٨.
٣١- وریا عومەر ئەمین، ئەلەمۆرفیمی رێزمانی، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٢)، سالی ١٩٨٩.
٣٢- نووری عەلی ئەمین، نیشانەکانی رێژەی فەرمان، رۆشنبیری نوێ ژمارە (١٠٦)، سالی ١٩٨٥.
٣٣- بایز عومەر ئەحمەد، پاشی بێن کەسان نە(جێناوی لکاو)، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٤٣)، سالی ١٩٨٦.
٣٤- وریا عومەر ئەمین، چەند پاسایەکی مۆرفۆلۆژی دارشتنی فەرمان، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٠٩)، سالی ١٩٨٦.

٣٥ د. ئەورەحمانی حاجی مارف، کرداری یاریدەدەر لەزمانی کوردیدا رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٩)، ساڵی ١٩٩٢.

## ٣- بەزمانی عەرەبی:

٣٦ د. عبدالرحمن ایوب، الكلام انتاجه وتحليله، الكويت ١٩٨٤.
٣٧ نعوم جومسكی، جوانب من نظرية النحو، ترجمة مرتضى جواد باقي، جامعة البصرة ١٩٨٥.
٣٨ روی. سی. هجمان، اللغة والحياة والطبيعة البشرية، ترجمة د. داود حلمی احمد السيد، جامعة الكويت ١٩٨٩.
٣٩ د. حاتم صالح الضامن، علم اللغة، جامعة بغداد، دار الحكمة، ١٩٨٩.
٤٠ احمد حسن احمد، قواعد اللغة الكردية باللغتين العربية والكردية (ريزمانی كوردی بەكوردی وبەعەرەبی) بغداد، ١٩٧٦
٤١ توفيق وهبی، قواعد اللغة الكردية، الجزء الاول، بغداد ١٩٥٦

## ٣- بەزمانی ئنگلیزی:

*42- Sherko BABAN & Salar HUSEIN, Programmable grammer of the Kurdish language, Research report Lp-95-02, Institute for Logic, Language and Computation, University of Amsterdam, Feb. 1995.*

*43- V.E. HOOPER, English verbs, BARRON's educational series, U.S.A 1991.*

*44- O. THOMAS and E. R. KINTEN, Transformational grammer and the teacher of English, Holt, RINEHART and WINSTON, Inc 1974.*

*45- B. L. LILES, An introductory, Tranformational Grammer, Prehice- Hall, Inc 1971.*

*46- T.WAHBY & C. J. EDMONDS, Kurdush-English dictionnary, OXFORD University Press 1966.*

## ٤- بەزمانی فەرەنسی:

*47- LE NOUVEAU BESCHERELLE 1, l'art de conjuger, dictionnaire de 12000 verbs, HATIER, Paris 1980.*

*48- BESCHERELLE 3, la grammaire pour tous, HATIER, Paris 1990.*

49- G. QUENELLE & D. HOURQUIN, 6000 Verbs Anglais et leurs compse's form et emplois, Collection BESCHERELLE, HATIER, Paris 1987.

50- R. LOISEAU, Outils, grammaire francaise, HACHETTE, Paris 1976.

51- M. SWAN et F. HOUDART, Pratique de l'anglais de A a Z, HATTIER, Paris 1983.

52- J .P. NARCY, G. BLEMONT et M. REBLO, Keep on lane, linguustics work and evaluation, Di ver, Paris 1983.

# پەراوێزەکان

**بەشی یەکەم:**

[١]: زاراوەی کەرەستە لەئێرەدا بەواتای (العُدد: Tool) هاتووە. کەرەستەش وەکوو هەر کەرەستەیەکی پیشەسازی بۆ هەڵبەستن وداڕشتن. لەهەندێک جێی تردا بەواتای (شت وەك) بەکارهێنراوە.

[٢]: ئەوەی تائێستا بۆ ڕەفتاری جێناوی لکاو نووسراوە بەهیچ جۆرێک کۆتایی ڕێگاکە نییە بۆنموونە سەرچاوەکانی (١٢،١١،٧،٦) زۆر بەوردی بەرەو (جێناو) ڕۆیشتوون بەڵام نەیان توانیوە بگەن بەمیکانیزمە بنەرەتییەکان.

[٣]: مەبەست لەنموونەی شاش وواش ئەوەیە کەجۆرەکان ودیوەکانی (بوون) تێکەڵ کراون لەگەڵ (بوونی بوونایەتی) وزۆر جار (بوون) و(هەبوون)یش لەیەکتری جودا نەکراونەتەوە. لەئەم ڕوانگەیەوە زۆرلە ڕێزمانووسان هەڵەیان کردووە ورەنگە ئێمەش بێبەری نەبین لەهەڵە ولەتێکەڵ کردنی (بوون) و(هەبوون) چونکە بابەتەکە زۆر ورد وناسك وبزێوە.

[٤]: سەبارەت بەئەم بۆچوونە د. نەسرین فەخری لەسەر چاوەی (٣) ئەمەی پات کردووەتەوە.

[٥]: بەڕاستی کەڵکی ناڕاستەوخۆی زۆر باش وەرگیراوە لەهەندێك لەسەرچاوەکان بۆ گەماڕۆدانی ئەو میکانیزمانەی کەلەنێو ئەم نووسینەدا ریزکراون. نووسینەکانی مامۆستای گەورە نووری عەلی ئەمین (بەتایبەتی سەرچاوەی ١٢) باشترین کەرەستەی خاون لەبەردەست دا وپاشان بیرەتیژەکانی مامۆستا مەسعوود محەمەد سازترین بەردەبازبوون گەیشتن بە ئەم ئەنجامە. پاشان تەکنیك ومیتۆدۆلۆژی مامۆستا وریا عومەر ئەمین مەودای بیرکردنەوە دەگەیاند بە حەشارگەکان.

بەڕاستی کەم وزۆر کەڵك وەرگیراوە لەئەو سەرچاوانە ولەزۆری تریش کەلەبیرکراون بەڵام کەڵکی ناڕاستەوخۆ و کەڵکی گشتی بۆ گەلاڵە کردنی کەرەستە خاوەکانی میکانیزمەکان. لەلایەکی ترەوە کەڵکێکی زۆر وەرگیراوە لەسەرچاوە ئینگلیزی و فەرەنسییەکان بۆ داڕشتنی خشتەکانی گەردان کردن و جودا کردنەوەی شێوازی نیازداری و گوماناداری. لە زۆر جێی تردا کەڵك وەرگیراوە لە گفت و گۆ لەگەڵ ڕێزمانووسان دا. بۆ نموونە لەکاتی وتنەوەی وانەکانی دکتۆرادا زۆر کەڵك وەرگیراوە لە گفت و گۆی فێرخوازەکان بەتایبەتی لە بیرۆچکەیەکی مامۆستا فەتاح مامە بۆ دابەش کردنی خانەی [٧-] وەك لەسەر وێنەی (١٢) دەرخراوە.

[٦]: زۆر پێویستە کەخوێنەر خۆی ڕابهێنێت لەگەڵ ئەم ناونانەدا بۆ ئەوەی بتوانێت لەبەشەکانی تردا سەرەداوەکان بدۆزێتەوە ونموونەکان لەیەکتری جودا بکاتەوە.

[٧]: لەهەندێك سەرچاوەدا (٣، ١٨، ٢٦) ئەوە دیاری کراوە کە (بوون وهەبوون) بە تێپەڕیش گەردان دەکرێن.

[٨]: بۆنموونه وەك کاری ناتەواو (دەبێت: یجب، ینبغي). ئەم کارە بەرامبەر بەکاری (falloir) دەوەستێت لەزمانی فەرەنسی دا کەلە لاپەڕە (٦١) لەسەرچاوەی (٤٧) گەردان کراوە.

[٩]: زاراوەی بگۆڕ بەرامبەر بە(متغیر : Variable) هاتووە، بڕوانە بۆ سەرچاوەی (١) بەشی پێنجەم.

[١٠]: ڕەگەزی (ەوە) ئەندازەیەکی بەکارە بۆ دابڕینی کاری (بوون وهەبوون) لە (بوونی بوونایەتی) ولەهەموو کاری زمانەکە.

[١١]: مامۆستا نووری عەلی ئەمین زۆر خۆی هیلاك کردووە بەئەم ڕەگەزەوە، (سەرچاوەی ٤، ٣٢، ....) بەلام ڕێبازی (پلیکانەی ڕستە) باشترن کەرەستەیە بۆ یەکلاییکردنەوە.

[١٢]: بڕوانە بۆ سەرچاوەی (١) بۆ جوداکردنەوەی شێوازی ڕستە لەنیازداری وگومانداریدا، (بەشی دووەم).

## بەشی دووەم:

[١٣]: میکانیزمی وەرچەرخان بەدیاریکراوی لەڕێزمانی (بوون وهەبوون) دا ڕوودەدات بەلام کاری (کەوتن) وەك دەستەبەرەیەك بەکار هێنراوە بۆ تێگەیاندنی بەرامبەر. دەربارەی ئەم دیاردەیە مامۆستای بەڕێز مەسعوود محەمەد (سەرچاوەی ٦، ٧) زۆر بەوردی درکی کردووە پێی (لەحەشارگەی کاری ئینتقالی پێچەوانەدا). بەراستی مامۆستا زۆر بەجوانی گەیشتووەتە نێو کانی زمانەکە ونووکی پاچەکەی گەیشتووە بەزێری زمانەکە. پاشان کەڵکێکی باش لەنووسینەکانی مامۆستا وەرگیراوە بۆ دابین کردنی میکانیزمی وەرچەرخان. لەگەڵ ئەوەش دا وەرچەرخانی کاری (کەوتن) بە هیچ جۆرێك ڕەسەن نییە وبریتییە لەئەنجامێك لەئەنجامەکانی میکانیزمی وەرچەرخان، کەبەسەرکاری (بوون)دا ڕوودەدات ولەڕووبەری زمانەکە بڵاو دەبێتەوە.

[١٤]: لەئێرەدا دەبا بنووسرابا (بەکار بهێنرێت).

[١٥]: بڕوانە بۆخشتەی (٢).

[١٦]: لەئێرەدا سیمای (زۆر لێکردن) هەیە لەلێکۆڵینەوەکەدا، مەرج نییە ئەوەی وتراوە بەتەواوی هەرئاوهابێت وڕەنگە بۆچوونی تریش هەبێت.

[١٧]: بڕوانە بۆ سەرچاوەی (١) بەشی چوارەم (پلیکانەی کردار).

[١٨]: مامۆستا مەسعوود محەمەد چەند نموونەیەکی لەئەم کارانە دیاری کردووە (سەرچاوەی ٧).

[١٩]: د. نەسرین فەخری ٠(سەرچاوەی ٣) ئەم ڕاستییە پات دەکاتەوە.

[٢٠]: بڕوانە بۆ سەرچاوەی (١)، بەشی سێیەم.

[٢١]: بەمان بەخشن بۆئەو هەڵەیە، ئەگەرنا دەبا لەئێرەدا بنووسرابا (دەربکەوێت) لەجیاتی (دەرکەوێت)، چونکە لە ڕێنووسی ئێمەدا نموونەی ئاوها مەگەر بەهەڵە دەربکەوێت.

[٢٢]: له زۆر جیٚ تردا ریٚژەی (هەیەتی) شیتەڵ دەکریٚتەوە و دووبارە دەبیٚتەوە. دەبیٚت بمان بوورن لە ئەوە چونکە بابەتەکە زۆر گرنگە.

[٢٣]: لەنیٚرەدا دەبیٚت بزانین کە مۆرفیمی (ـە) چەند بەنازە بەدوو ناوگر (ی) و (ت) دەی پاریٚزن تا ون نەبیٚت و لەسەر پیٚ رابوەستیٚت، چونکە ئەرکە ریٚزمانییەکەی زۆر گرنگە. ئەوش لەیاد نەکەین کەدەنگی (ی) ناوگریٚگی دەرەکییە و دەنگی (ت) ناوگریٚکی ناوەکییە و لەکاتی پیٚویست دا زیندوو بووەتەوە.

[٢٤]: بروانە بۆ برگەی (٢: ٤: یەکەم). زۆر لەریٚزمانووسان درکیان بەئەم ڤایرۆسە کردووە، بەلاٚم کەسیان سەرچاوەکەیان دیاری نەکردووە.

[٢٥]: دەرکەوتنی رەگەزی (ـە) زۆر زۆر هەرەمەکییە وهیٚشتا نەخشەی تەواوی بۆ دانەریٚژراوە لەرووبەری زمانەکەدا. هەر لەبەر ئەوە هەر هەمووومان هەڵە دەکەین لەئاستی. تەنانەت لە زۆر جیٚدا لەئەم نووسینەدا ئیٚمەش بەرچاومان لیٚڵە چونکە رەگەزی (یٚت)، کەجیٚناویٚکی بتەرەتییە، لەهەندیٚك جیٚی تردا جیٚناو نییە ومۆرفیمی ئیستاییە.

[٢٦]: ئەمە تەنها بۆچوونە ومەرج نییە وابیٚت.

[٢٧]: لەزمانی فەرەنسیدا دەنگی (h) بەئەو چەشنە گۆدەکریٚت. زۆر جاریش لەژینگەی دەنگسازیدا بە (بزویٚن) دەژمیٚردریٚت. (٤٨،٤٧).

[٢٨]: لەنیٚرەدا بە هەڵەی ریٚنووس نووسراوە (داگرین)، دەبا نووسرابا (دابگرین).

[٢٩]: رەگەزی (ـە) بەدیاری کراوی لەهەموو زمانەکەدا بریتییە لە ریٚژەی رانەبردووی تەواو لەکاری (بوون) لەجۆری دووەم. لەپەراویٚزی (٢٥) دا وترا کەدەرکەوتنی ئەم رەگەزە زۆر هەرەمەکییە بەلاٚم لەنیٚرەدا هەڵەکە زۆر ئاشکرایە.

[٣٠]: بروانە بۆ بەشی هەشتەم بۆ تیٚگەیشتن لەئەم دیاردەیە.

**بەشی سیٚیەم:**

[٣١]: نیشانەی کۆ (+) هیٚمایە بۆ ریٚژەی (تیٚپەر) و نیشانەی کەم (-) هیٚمایە بۆ ریٚژەی (تیٚنەپەر). بەلاٚم نیشانەی کەم وکو لەگەڵ ژمارەکان دا بریتییە لەشویٚنی خانەکان بەرادەی خانەی (سفر). نیشانەی کۆ (+) دەکەویٚتە لای راست ونیشانەی کەم (-) دەکەویٚتە لای چەپ.

[٣٢]: وشەی (گوڵەکە) یان (phases) بەواتای (اطـوار) هاتووە، وەك میتالۆگرافی دا بەکار دەهیٚنریٚت.

[٣٣]: لەبەر کیٚشەی ریٚنووس، لەنیٚرەدا ریٚژەی رابردووی تەواو لە(بوون) بەئەم چەشنە نووسراوە (بوو:ون).

[٣٤]: بروانە بۆ سەرچاوەی (٤٧) لاپەرە (٣٨) بۆ گەردان کردنی ئەم کارە.

[٣٥]: د. محمد نووری عارف، دانیشتنی تایبەتی لەگەڵ ریٚز و سوپاس دا. د.نەسرین فەخری (٣) بەبەراورد لەگەڵ عەرەبی ئەم کارەی دابریوە لەجۆرەکانی تر بە جوانی.

[٣٦]: بروانە بۆ پەراویٚزی (٣٣) دەربارەی کیٚشەی ریٚنووس.

[٣٧]: برگەی (رابردووی تەواو)، دەبا لەسەر لاپەڕەیەکی پێشتر دەرچووبا.

[٣٨]: بمان بوورن کەلەئێرەدا نووسراوە (دەمان گێرێتەوە سەر ...)، دەبا بنووسرابا (دەمان گێرێتەوە بۆ سەر ...).

[٣٩]: ئەم ژمارانە تەنها لەگەڵ رستە تێپەڕەکەدا ریزکراون.

[٤٠]: سەرچاوەی (٤٩)، زانیاریی تەواو وگەردان کردنی ئەم کارە هەڵ دەگرێت.

[٤١]: سەرچاوەی (٤٧)لاپەڕە (١٦). گەردانامەی ئەم کارە بەجوانیپیشان دەدات. یان سەرچاوەی (٤٣) لاپەڕە (٨٨).

[٤٢]: بڕوانە بۆ پەراوێزی (٣٥).

[٤٣]: زاراوەی (شووشە) لەئەوەوە هاتووە کەروونە و نابینرێت وناسکە ودەشکێت. جۆرە کەرەستەی ئاوها (ناسك :fragile ) دەبێت بەکارامەیی سەوا بکرێت.

[٤٤]: بڕوانە بۆ بەشی دووەم بۆ نەخشەی پەیدابوونی ئەم ڤایرۆسە. لەلایەکی ترەوە وشەی (ڤایرۆس) لەئەوەوە هاتووە کەبلاو دەبێتەوە وڕووبەرێکی بێ گەرد دەلەوتێنێت. بەئەم دیاردەیە لەرانەبردووی تەواودا وبەدیاری کراوی لەکاری (بوون) دا لەدایك دەبێت. لەنێو ئەم کتێبەدا لەریزەی (هەیەتی) دا شیتەڵ کراوەتەوە وباس کراوە کەلەژینگەیەکی دەنگسازیانەی زۆر زۆر ورد وتەسك ومایکرۆسکۆپی دا ڕوودەدات. ئەم ڤایرۆسە بەپردی (میکانیزمی رۆنان) دەپەڕێتەوە بۆ رووبەری رابردوو (بەشی شەشەم).

[٤٥]: مامۆستا نووری عەلی ئەمین لەسەرچاوەی (٤) دا نموونەی (دە هە بوو) ی ریزکردووە. بەبۆچوونی ئێمە ئەو نموونەیە دەبا بنووسرابا (دە بوو). واتە دەبا لەهەموو نموونەکان دا، کە (دە) و(نە) هەیە، رەگەزی (هە) لابرابا.

[٤٦]: لەبەر ئەوەی (هەبوون) خۆی هەر لە (بوون)ەوە هاتووە وبەلام روخسارەکەی پتەوترە، دەبێت بە دەستەبەرەیەکی جوان بۆ دابین کردنی (میکانیزمی وەرچەرخان) و(میکانیزمی رۆنان). واتە ئەو دوو میکانیزمە لە (بوون) دا روو دەدەن بەلام لەئەم لێکۆڵینەوەیەدا بە (هەبوون) روونی دەکەینەوە کە لە بنچی (بوون)ەوە دارێژراوە.

[٤٧]: لەئێرەدا ئەو دەنگەی کەتاریك کراوە جێناوەکەیە وئەوی تر کەتاریك نەکراوە ناوگرە.

[٤٨]: تێگەیشتن لەئەم نموونەیە نەختێك شارەزایی دەوێت ورەنگە هەموو کەسێك نەتوانێت بەئاسانی تێیبگات چونکە دەبێت بە ئەم چەشنە گۆ بکرێت (هەی : یە).

[٤٩]: ئەم نموونانە بەزاری گەرمیان نووسراون.

## بەشی چوارەم:

[٥٠]: لەئێرەدا ئەم سەرنجانە هەن:

یەکەم: مەرج نییە هەموو ریژەکانی نیازداری وگومانداری، کە لەسەر خشتەی (١٢،١١،١٠،٩،٨،٧) ریزکراون، بەرەویان هەبێت بەلام بەریزمانەکە دروست دەکرێن. بەرامبەر بەئەمە هەموو ریژەکانی (ئاشکرا) لەهەر شەش خشتەکەدا بەرەویان هەیە

وهەموو ڕیزەکانی (ڕانەبردوو) بەرەویان هەیە. واتە ئەم کێشەیە هەر (ڕابردوو) دەگرێتەوە.

دووەم: لەهەندێك لەخشتەکان دا، جێناوە ومەرجەر خاوەکان وەك سپرینگێکی تـرازاون تا بەپێشکارێك نەبەسترێن واتا نابەخشن وەك لەئەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

-خشتەی (٨)، ڕابردووی نزیك:

| | | | |
|---|---|---|---|
| تۆ | - | ت | بوو |
| نۆ | منداڵ | ت | بوو |

- خشتەوی (١٠)، ڕانەبردوو:

| | | | |
|---|---|---|---|
| تۆ | - | ت | ە |
| تۆ | هەڵامەت | ت | ە |

سـێیەم: لەخشتەی (١٠، ١٢) دا لەکەسی سـێیەمی تـاك دا ڕوخساری (ــەتی) بێبایە خ کراوە، بۆ ئەوەی ڕیزمکە تێك نەچێت.

[٥١]: دەبا ئەوسێ نموونەیە لەیەك جێدا ڕیزکرابان کەچی ڕستەی یەکەم لـە دووانەکەی تر جودا بوومەتەو، دەبێت بمان بەخشن.

[٥٢]: ئەم دیاردەیە یەکێکە لەسەرچاوەکانی (پەرپووتی وهەرەمەکێتی) لەزمانی نووسین دا.

## بەشی پێنجەم:

[٥٣]: بڕوانە بۆ سەرچاوەی (١) بەشی پێنجەم.

[٥٤]: زاراوەی (نزیك) واتای (خانەی ڕابردووی نزیك) دەبەخشێت کەبریتییە لەخانەی [٣٠] وزاراوەی (دوور) واتا خانەی ڕابردووی دوور دەبەخشێت کەبریتییە خانەی [٤-].

[٥٥]: بڕوانە بۆ خشتەی (٦)، لە ئەوێ دا ئەو بابەتە نموونە ڕێژکراوە.

[٥٦]: هەندێك سەرچاوە باسی ئەو دەکەن کەبوون کردارێکی یاریدەرە (٢٠) لەروخساری ڕێژەی ڕابردووی دووردا.

[٥٧]: لەئەم ڕوانگەیەوەدا واهەست دەکرێت کە کاری (بوون) وکـاری (بوونی بوونایەتی) بەهەر دووکیان بتوانن جێی کارێکی ئاسایی پڕبکەنەوە لەڕانەبردوودا.

## بەشی شەشەم:

[٥٨]: بابەتەکە تەرخان کراوە بۆ ناسینەوەی ڕێژە ورد وبزێوو شووشەییەکانی (بوون) لە ڕوخساری ڕێژەی کاری ئاساییدا. هەر لەبەرئەو ولەبەر مەبەستی لێکۆڵینەوە خشتەکان بەتەواوی پڕکراتونەتەوە. داوای لێبوردن دەکەین لەرەخنەگران.

[٥٩]: بڕوانە بۆ پەراوێزی (٥٠) خاڵی دووەم.

[٦٠]: سەرچاوەکانی (٤٧، ٤٨، ٥١، ٥٢) باشترین کەرەستەن بۆ دەرخستنی ئەم جۆرە لەڕیزەی ڕابردوو لە ڕیزمانی فەرەنسی دا.

[٦١]: هەرچەندە ریزەی (گرتوتەوە) ئاوها گۆدەکرێت بەلام راستتر ئەوەبوو کەبنووسرابا (گرتووەتەوە).

## بەشی حەوتەم:

[٦٢]: لەسەرچاوەی (١)دا، ئەوە باس کراوە، لەلایەن خۆمانەوە، کەریزەی رانەبردوو بریتی‌یە لەریزەی بنەرەت. بەلام لەمنیرەدا بەتەواوی ئەمو بارە روون دەکەینەوە ونهینی‌یەکانی ئەو ریزەیە دەردەخەین بەبەراورد لەگەڵ ریزەی رابردوو.

[٦٣]: لەمنیرەدا بەهەلەی چاپ رستەی شەشەم کرتاوە کە بریتی‌یە لە:

ئەوان دەخەو (ن) ، یان: ئەوان دەگر (ن)

[٦٤]: دیاردەی روخساری گۆرین تەنها هەرکەسی سێیەمی تاک دەگرێتەوە.

[٦٥]: بروانە بۆ سەرچاوەی (١)، خشتەی (٧) ووێنەی (١٩،١٩،٢٠،٢١).

[٦٦]: لەمنیرەدا ژیربەشی کارئاسایی‌یەکان یەکسانە بە (رانەبردووی سادە) وژیربەشی یاریدەدەر یەکسانە بە (رانەبردووی تەواو).

[٦٧]: بروانە بۆ برگەی (٢:١).

[٦٨]: ئەم دیاردەیە تەنها لە (بوونی بوونایەتی) دا هەیە بروانە بۆ برگەی (١:٤).

[٦٩]: دەبێت بمان بەخشن کە لەمەو پۆلە جیناوەدا جیناوی کەسی یەکەمی کۆ (ین) ئاودیو بووە.

[٧٠]: مەبەست لەزاراوەی (تاك واتایی) ئەوەیە واتای کاتی ئیستایی لەریزەکەدا نی‌یە.

[٧١]: لەمنیرەدا بەهەلە نووسراوە (لەدەمکاتی رابردوودا) لەرەسەن دا دەبا بنووسرابا (لەدەمکاتی رانەبردوو).

[٧٢]: پارچۆلکەی دوو رەگەز (نی) باشترین ئەندازە (معیار)ە بۆ ناسینەوەی ریزەکانی (بوون وهەبوون).

[٧٣]: بروانە بۆ پەراویزی (٥٧).

[٧٤]: لەمنیرەدا بەهەلە نووسراوە (بوون)، دەبا بنووسرابا (هەبوون).

[٧٥]: لەمنیرەدا بەهەلە نووسراوە (بروانە خالی یەکەم) لەرەسەن دا دەبا بەرینووسی (بروانە بۆ خالی یەکەك) بنووسرابا.

[٧٦]: ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەریزەی (بوون) دەتوانێت ژیرەی رابردووی خۆیشی روبنێت، وەك لەسەر خشتەی (١٧) دەرخراوە.

## بەشی هەشتەم:

[٧٧]: ئیمە لەگەڵ ئەو بەریزانەدا نین کەدەیانەوێت (یت) بەجیناو ئەناسن وروخساری بشێوینن (سەرچاوە ٢٢،٧)، ئەمو نادیاری‌یەی لەمەم کەسەدا هەیە لەرانەبردووی تەواوی (بوون وهەبوون) دا دەست پێدەکات و بە (وەرچەرخان) دەبێت بەبەرکار وپاشان پردی (رۆنان) دەپەرێتەوە بۆ رابردوو. هەر لەبەر ئەوە، خۆزگا ئەو بەریزانە

وازیان لەنەو بۆچوونـە دەهێنـا، چونکـە وامیکانیزمەکـەی ئاشکرا بـووە (بڕوانـە بـۆ پەراوێزی ٩٠).

[٧٨]: بۆ نموونە لەریزەی (ناردم) دا شەبەنگی بەرکاریکی نادیار هەیە بەرامبەر بەکەسی سێیەمی تاك بەلام لە (دەنێرم) دا بەهیچ جۆرێك ئەو شەبەنگە نییە. واتە بـەرکاری نادیار نییە.

[٧٩]: مامۆستای بەرێز وریا عومەر ئەمین، سەرچاوەی (١١)، لاپەرە (٧)، نیگارێکی جوانی کێشاوە بۆ گۆرینەوەی ئـەرك لـەنێو جێنـاوی (تـان) و(یـن) لەنموونـەی (دە تـا نێرین)و (دە تان نـاردین)دا. واتـە لـەنێوان کـاتی رانـەبردوو وکـاتی رابـردوودا.ئـەم راستییە زۆر لەرێزمانـنوسان هەستیان کردووە پێی ئەو دیاردەیە ئەنجامی ئـەو دوو میکانیزمەیە کە باس کراون. لەنەوێدا بنەمای (بەرکار پاشان بکەر) وەرچەرخاوە لـەکاری (بـوون) دا وپاشـان ئـەو بنەما وەرچـەرخاوە (بکـەر پاشـان بـەرکار) فرۆشراوەتەوە بە رووبەری رابردوو بە (میکانیزمی رۆنان) ئێمەش کەڵکێکی زۆرمـان وەرگرتـووە لـە نەخشـەکەی مامۆسـتا بـۆ دیـاری کردنـی میکانیزمـەکان. سـەبارەت بەنادیاری، بێ گومان (میکانیزمی رۆنان) ئەو جێناوە نادیارە دەفرۆشـرێتەوە بـەروو بـەری رابـردوو، چـی وەك (بکـەر) و چـی وەك (بـەرکار). وێنـەی (١٣) بـەجوانی ئـەو میکانیزمە روون دەکاتەوە.

[٨٠]: لە نێرەدا بەهەڵەی چاپ لە جیاتی (تێنەپەر) نووسراوە (تێپەر).

[٨١]: ئێزگەی وەرچەخێنەر بریتـی یـە لـە (میکانیزمی وەرچـەرخان) بڕوانـە بـۆ وێنەی (٢٢)، خاڵی (ج).

[٨٢]: زۆرجار نیشانەی کەم (-) لەلای چەپەوە دەرکەوتووە دەبێت بمان بەخشن.

[٨٣]: ئەم کتێبە بریتـییە لەنـەلبوومێك بـۆ رێـزە و رۆنـانی رێـزە لەرووبـەری زمانەکـەدا ولەنەوێ دا رێزمانی بوون و هەبوون جوانتر روون دەبێتەوە.

## بەشی نۆیەم:

[٨٤]: لەنێرەدا کەبەشەکە ناونراوە (بەرنجام لەرێزمانی بوون وهەبوون دا)، بۆ ئـەو بـووە کەهەموو میکانیزمـە بنەرەتییـەکان بریتـین لەبـەرەنجامی (رووبـەری رانـەبردووی تەواو). ئەگـەرنا دەبـا ئـەم بەشـە ناونرابـا (بـەرەنجام لەمیکانیزمـە بنەرەتییـەکانی رستەسازیدا).

[٨٥]: وەك مامۆسـتا مەسـعوود محەمـەد دەڵێـت (بـۆ فـەرق کردنـی جووجەڵـە ورد وبزێوەکـانی کـە وسوێسـکە لـەنێو بـەردەلانی زمانەکـەدا). واتـە بـۆ بینینـەوە وناوسینەوەی رێـزە وردو ناسکەکانی (بـوون وهـەبوون) لـەنێو ئاخـاوتنی کـوردیدە، (سەرچاوەی ٧).

[٨٦]: لەنەو نموونانەدا کە وەرچەرخان، بکەری جودا وبکەری لکاو (جێناوی لکاو) تارێك کراون بۆ تێگەیشـتن لەمیکانیزمەکە وجودا کردنەوە هەرسێ جۆرەکەی (بوون)، ئەویش بەبەراورد لەگەڵ کاری (کەوتن).

[٨٧]: ئەمەیش رێچکەیەکی والایە بۆ فراوان کردنەوەی رروبەری زمانەکە.

[٨٨]: بەئاشکرا دیارە کە وشەی (سارد) وریزەی (کەوتوو) لەباوەشە والاکەی ریزەی (بوون)دا دانیشتوون.
[٨٩]: بۆ نموونە، رەنگە چاو بخەلەتێت لەناستی رستەیەك دا وەك (چی گوڵە هەمووی بهێنن)، کەلەرەسەن دا بریتییە لە (چی گەڵ هەیە هەمووی بهێنن). لەئێرەدا هەر بەساکاری دەوترێت (چی هەیە هەمووی بهێنن) وناوترێت (چییە هەمووی بهێنن).
[٩٠]: بەداخەوە، هەندێك لەرێزمانئووسان داکۆشان لەسەر ئەوە دەکەن جێناوی (یت) بریتییە لە (ی) وجێناوی (یت) بریتییە لە(ی)، (سەرچاوە ٦،٧،٢٢). یان هەندێك دەڵێن ئەو جێناوە هەرنییە. ئێمە لەئەو باوەڕەداین کەئەو بەڕێزانە ئەختێك لەئەو بۆچوونەی دوایی دەگۆڕن لەپاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە (بەتایبەتی بەشی هەشتەم). لەبەر ئەوەی جێناوی (یت) بەئەو روخسارە هەیە ونادیاریش نییە. رێچکەی نادیاری لەبڕگەی (٨: ٢)ەوە دەست پێ‌دەکات وبلاودەبێتەوە. سەبارەت بەجێناوی (یت)، ئەو جێناوە بەهیچ جۆرێك نادیارنییە لەرووبەری هەموو زمانەکەدا و دەبێت بەئەو روخسارەیش بپارێزرێت. سەبارەت بەدەنگی (ت) لە رەگەزی (یت) دا، ئەو دەنگە چۆن ببێت بە (ئەبوو) کەلەهەندێك رێژەدا نییە وەك (دەچێ) وهەیە وەك (دەچێت) ولەهەندێك رێژەدا بە(ناچاری) هەیە وەك:

پاشگری (ەوە): دەچێ+(ەوە): دەچێتەوە
ئامرازی (ـە): دە چێ+(دەرەوە): دەچێتە دەرەوە
ئامرازی (ێ): دەیدا پێی: دەیداتێ

بەئەم شێوەیە، ئەگەر دەنگی (ت) جارێك (هەبێت وئەبێت) و چەندجارێکی تر (هەبێت) بەناچاری ئەدی بۆچی (ئەبێت). ئەو مامۆستایانە داکۆشان دەکەن لەسەر ئەبوونی دەنگی (ت) کەچی ئێمە تازە دەنگی (ت)ی کپ دەدۆزینەوە لەنێو مۆرفیمی (ـە)دا. تۆ بڵێیت، ئەتلەسی ئەم زمانە دەنگی کپ ئەبێت تێیدا.
دووەم: ئەدی، جێناوی (ت) چیبکات خۆ ئەویش کەلەزۆر ناوچەدا کلۆرکراوە. خۆئەگەر گرافیمێك هەبا بۆبزوێنی (i) ئێستا ئەویش ناودێو دەکرا. ئەوی سەیرە پایەبەرز تۆفیق وەهبی (سەرچاوەی ٢٦) لەساڵی ١٩٢٩ دا ئەوەی دیاری کردووە رێژە (ناردت)ی بە روخساری (ناردي) تۆمار کردووە. واتە دەنگی (یِ) نوختەداری بەرامبەر بە بزرۆکە (i) داناوە.
[٩١]: لەئێرەدا لەجیاتی (رابردووی تەواو) دەبا بنووسرابا (رانەبردووی تەواو). دەبێت بمان بوورن.
[٩٢]: لەپارچۆلکەی (بێت)دا روخساری (یت) بریتییە لەمۆرفیمی ئێستایی لەشێوازی گومانداری. ئەم دیاردەیە لەبەرهەمی داهاتوودا بلاو دەکرێتەوە بەلام لەئێرەدا پارچۆلکەی (بێت) دەستکاری نەکراوە لەرووی شێتەڵکارییەوە.
[٩٣]: لەئێرەدا خاڵی تریش هەیە بەلام هەر ئەوەندە بەسە.
[٩٤]: بروانە بۆ پەراوێزی (٨).

[٩٥]: بڕوانە بۆ بەشی هەشتەم وێنەی (١٢).
[٩٦]: پرۆفیسۆر وریا عومەر ئەمین لەسەرچاوەی (١١)دا، لەلاپەڕە (٢٦)دا باری وەرچەرخاوی ئەم کارەی دەرخستووە.
[٩٧]: تەنها مۆرفیمی (ـە) لادەچێت لەرابردووی نزیك ودوور وبەردەوام دا چونکە گیانی ئێستایی نییە.
[٩٨]: نموونەیەکی نادروست بریتییە لەگواستنەوەی ناوگری (ی) لەگەڵ (ـەتی)دا بۆ ڕێژەی رابردووی تەواو. ئەگەرنا دەبا بنووسرابا (ناردوومتی) لەجیاتی (ناردوویەتی).
[٩٩]: تکایە پەراوێزی (٨٥) بخوێنەرەوە.
[١٠٠]: لەبەرهەمی داهاتوودا ئەتڵەسی (جێناوی لکاو) دەکەینەوە وناوەڕۆکی کتێبی یەکەم وئەم کتێبە دەکەین بەکەرەستە وبەرووبەری کرمانجی خواروودا دەڕۆین وبۆ جێناوی لکاو دەگەڕێین. ئەم کارە ئێستا لەژێر چاپ دایە وبەم زووانە دەکەوێتە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێز.

# ليستى زاراوەكان

| كوردى | عەرەبى | ئينگليزى |
| --- | --- | --- |
| ا ئاست | مستوى | Level |
| ئاشكرا | صريح | Indicative |
| ئامرازى پەيوەندى | حروف الجر | Preposition |
| ئاوێتە بوون | التفاعل | Reaction |
| ئەرێ | حالة الاثبات | Affirmative |
| ئەندازە | المعيار | Criterion |
| ئەندازيارى | الهندسي | Geometric |
| ئەرك | الوظيفة | Function |
| ئەرك گۆركێ | التبادل الوظيفي | Function change |
| ئيسك، چێوەبەند | الهيكل | Structure, frame |
| ئێستايى | حالة الحاضر | Present |
| ئاوەڵگوزار، ئاوەڵكار | الظرف | Adverb |
| ئاخاوتن، گوفتار | الكلام | Parole |
| ئيلاستيك، نەرم | مرن | Elastic |
| ب بارگە | الشحنة، الحمل | Charge |
| بەردەوامى | الحالة الاستمرارية | Continuity |
| بەركار | المفعول به | Object |
| بەركارى لكاو | المفعول المتصل | Inplicit object |
| بەجێ | معقول، منطقي | Logical,reasonable |
| بەڵگە | دليل | Evidence |
| بەراوێتە كردن | اجهاض | Abortion |
| بەركارى جودا | المفعول المنفصل | Object |
| بەركارى ناراستەوخۆ | المفعول غير المباشر | Indirect object |
| بكەر | الفاعل | Subject |
| بكەرى لكاو | الفاعل المتصل | Inplicit subject |
| بزوێن | حرف علة | Vowel |
| بكەرى دەرەكى | الفاعل | External subject |
| بنج | جذر الفعل | Radical (stem),root |
| برگە | العبارة | Phrase |

| | | |
|---|---|---|
| Passive voice | المبني للمجهول | بكەر نادیار |
| Verb (to be) | فعل الاسناد | بوونی یاریدە |
| Noun complement | المضاف والمضاف اليه | بارو سەربار |
| Rule | قاعدة | بنەما |
| Variable | متغير | بگۆڕ |
| Potential | نشاط | بزاڤ |
| | | |
| Element, particle | العنصر،الجزيئة | پ پارچۆلکە، رەگەز |
| Prefix | سابقة | پێشگر |
| Preverb | ما يسبق الفعل | پێشکار |
| Configuration | الشكل الهندسي | پلیکانە |
| Classification | التصنيف | پۆلین کردن |
| Silent | حرف صامت | پیتی کپ |
| Vowel | حرف علة | پیتی بزوێن |
| Accesory | توابع الجملة | پەل و پۆ |
| Sufix | اللاحقة | پاش گر |
| Class | صنف | پۆل |
| Application | التطبيق | پیادە کردن |
| | | |
| Singular | المفرد | ت تاك |
| Transitive | فعل متعدي | تێپەڕ |
| Intransitive | فعل لازم | تێنەپەڕ |
| Deformation | تغيير الشكل (تشكيل) | تێك چوونی روخسار |
| Transifing | جعل اللازم متعديا | تێ پەڕاندن |
| Ambiguity | الغموض | تەم و مژ |
| | | |
| Mobility | تغيير الموضع (تحرك) | ج جێگۆڕکێ |
| Mobile | متحرك | جێ گۆڕ |
| Pronoun | ضمير | جێناو |
| Inplicit pronoun | ضمير متصل | جێناوی لکاو |
| Explicit pronoun | ضمير منفصل | جێناوی جودا |
| Hidden pronoun | ضمير مستتر | جێناوی نادیار |

| | | |
|---|---|---|
| Immobile | ساكن | جێ نەگۆر |
| Demonstrative pronoun | اسم الاشارة | جیناوی نیشانه |
| | | |
| Structure | الهيكل | چ چێوه، چێوەبەند |
| Infinitive | المصدر | چاوگ |
| Row | الصف الافقي | چین |
| | | |
| Box | الصندوق، الموضع | خ خانه |
| Possession | التملك | خاوەنێتی |
| | | |
| Phenomenon | ظاهرة | د دیارده |
| Tenses | ازمنة الفعل | دەمکات |
| Subjonctive | الطلب | داخوازی |
| Derivation | الاشتقاق | دارشتن |
| Phase | طور | دیو |
| | | |
| Orthography | الاملاء | ر رێنووس |
| Present | المضارع | رانەبردوو |
| Past | الماضي | رابردوو |
| Simple Past | الماضي القريب (البسيط) | رابردووی نزیك |
| Continuos past | الماضي المستمر | رابردووی بەردەوام |
| Plu-perfect | الماضي البعيد | رابردووی دوور |
| Past perfect | الماضي التام | رابردووی تەواو |
| Form, morphology | الشكل | روخسار |
| Action | الحدث | رووداو |
| Soft elements | العناصر الرقيقة | رەگەزە ناسکەکان |
| Sentence | الجملة | رسته |
| Regular | منتظم | رێك |
| Syntax | النحو | رستەسازی (سینتاکس) |
| String | الصف، رتيبة | ریز |
| Rearrangement | اعادة ترتيب | ریز گۆرین |

| | | |
|---|---|---|
| Derived form | الصيغة | رێژه |
| Matricial forms | صيغة الاساس | رێژه بنەرەت |
| Designing formation | بناء الكلمة | رۆنان |
| Built up forms | الصيغة المبنية | رێژەی رۆنراو |
| Root | الجذر | رەگ |
| Behavior | السلوك | رەفتار |
| Term | مصطلح | زاراوه |
| | | |
| Language | اللغة | ز زمان |
| Linguistic | علم اللغة | زمانەوانی |
| Native or mother Language | لغة الام | زمانی دایك، زمانی شیری |
| Chain | سلسلة | زنجیره |
| | | |
| Column | العمود | س ستوون |
| Initial | الابتدائي | سەرەتایی |
| Simple | بسيط | ساده، سانا |
| | | |
| Mood | الاسلوب | ش شێواز |
| Spectrum | طيف | شەبەنگ |
| | | |
| Interest | فائدة | ك كەڵك |
| Verb | الفعل | كار |
| Tool | عدة، اداة | كەرەسته (ئامراز) |
| Verb | الفعل | كردار |
| Plural | الجمع | كۆ |
| Auxiliary | الفعل المساعد | كاری یاریدە |
| | | |
| Pronunciation | التلفظ | گ گۆ كردن |
| Conditional | الحالة الشرطية | گومانداری |
| Speech, Parole | الكلام | گوفتار |
| | | |
| Compound | المركب | ل لێك دراو |

| | | |
|---|---|---|
| Lateral | جانبي | لاوەکی |
| Noun phrase (NP) | العبارة الاسمية | لارستەناو |
| Verb phrase (VP) | العبارة الفعلية | لارستەکار |
| | | |
| Mechanism | الية | م میکانیزم |
| Feeding | تطعيم (التغذية) | متوربەکردن |
| | | |
| Compound | مركب | ن ناسادە |
| Negation | حالة النفي | نەرێ |
| Invariable | ثابت | نەگۆڕ |
| Irregular | غير منتظم | نارێك |
| Infex | اللاحقة، الوسطية | ناوگر |
| Subjunctive | الحالة الانشائية (حالة النصب) | نیازداری |
| Sign | العلامة | نیشانە |
| Defective | ناقص | ناتەواو |
| | | |
| Potential | القوة | هـ هێز، بڕشت |
| Motive | دافع | هاندەر |
| Random | عشوائي | هەرەمەکی |
| Equation, formula | معادلة | هاوکێشە |
| | | |
| Morphology | الصرف | و وشەسازی |
| Transformation | التحويل | وەرچەرخاندن |
| Semantics | علم الدلالة | واتاسازی |
| Meaning | المعنى، المغزى | واتا |

## لێكۆڵینەوە زانستییە بڵاوكراوەكانی نووسەر لە بواری ئەندازیاری

**یەكەم بەزمانی فەرەنسی:**

١- لێكۆڵینەوەیەك لەسەر

Etude de la resistance a lèndommagement des galets de laminoire à chaud....

بڵاوكراوەتەوە لە پاریس لە گۆڤاری :

Revue metallurgie, No 9, 80e annee. Paris, septembre 1983, page 487.

منشور في مجلة (علم المعادن)، العدد ٩، السنة الثمانون ايلول ١٩٨٣، ص٤٨٧، پاريس.

٢- لێكۆڵینەوەیەك لەسەر :

Importance de phenomenes electrochimique dans lèndommagement dùn acier peu allié..

بڵاوكراوەتەوە لە نۆیەم كۆنفرانسی جیهانی بۆ دارزینی كانزاكان، لەشاری تورەنتۆ - كەنەدا، ساڵی ١٩٨٤ .

(منشور في وقائع المؤتمر العالمي التاسع لتأكل المعادن، مدينة تورنتو - كندا ١٩٨٤، ص ١٧١ - ١٧٦).

Proceedig of 9th international congress on metallic corrosion Toranto - Canada, June 3-7 1984, page 171 - 176

٣- ئامادەبوون و پێش كەش كردنی سیمینار و بڵاوكردنەوەی لێكۆڵینەوەیەك لەسەر :

Etude de léndommagement sous solliciatation multiple de super alliage recharges..

لە كەنەدا لە حەوتەم كۆنفرانسی جیهانی بۆ بەرهەڵستی كانزاكان، لە شاری مۆنتریال - ساڵی ١٩٨٥ .

(المشاركة والقاء محاضرة عن البحث في المؤتمر العالمي السابع لمقاومة المواد، المنعقد في مدينة مونتريال في كندا ١٩٨٥ منشور في وقائع المؤتمر ص ١٥٦٩ - ١٥٧٤).

Proceeding of 7th international conference on the strength of metals and alloys, Montreal - Canada 12-16 Augest 1985, page 1569 - 1574.

٤- لێکۆڵینەوەیەک لەسەر :

Etude de lévolution micro-structural dún alliage base cobalt sollicite en cyclage thermique.

بلاوکراوەتەوە لە پاریس لە کۆنگرەی:

SFM-Fatigue a hante temperature, Paris, Juni 1986.

(مؤتمر الكلال في درجات الحرارة العالية، الجمعية الفرنسية لعلم المعادن، باريس ١٩٨٦).

## دووەم : بەزمانی ئینگلیزی :

٥- لێکۆڵینەوەیەک لەسەر :

Study of hard faced steels under thermal and tribological strains, Application to copper Hot - rolling.

چوارەم کۆنگرەی کۆنتیرۆد، لە شاری ئوزاکا لە ژاپۆن ساڵی ١٩٨٥

(مؤتمر كونتيرود الرابع المنعقد في مدينة اوزاكا في اليابان - ١٩٨٥).

٦- لێکۆڵینەوەیەک لەسەر :

Surface morphology and contact nature in abrasion processes.

گۆڤاری کۆلیجی پەروەردە، بەرگی (٤) ژمارە (٤) هەولێر ١٩٩٤

(مجلة كلية التربية المجلد ٤ العدد، اربيل ١٩٩٤).

٧- لێکۆڵینەوەیەک لەسەر :

Effect of low values of surface roughness in abrasive wear mechanism.

گۆڤاری زانکۆ، بەرگی (٦) ژمارە (٣) هەولێر ١٩٩٤.

(مجلة زانكو المجلد (٦) العدد (٣) اربيل ١٩٩٤).

## سێیەم : بەزمانی عەرەبی :

٨- لێکۆڵینەوەیەک لەسەر :

(تطوير سبائك الالمنيوم المستخدمة في تصنيع مكوك الغزل في مكائن الغزل والنسيج)

گۆڤاری زانکۆ، بەرگی (٥) ژمارە (٢)، هەولێر ١٩٩٢.

٩- لێکۆڵینەوەیەك لەسەر :
(دراسة تأثير الاجهاد المسبق على مقاومة التاكل الميكانيكي لصلب منخفض الكاربون)
کۆنگرەی زانکۆی تکریت، کانوونی دووەم ١٩٩٢ .

١٠ - لێکۆڵینەوەیەك لەسەر :
(مدى استخدام رمل ارضية في تهينة قوالب السباكة بواسطة ماكنة الرج و العصر)،
مؤتمر جامعة صلاح الدين، اربيل ١٩٩٣).

## لێکۆڵینەوە زانستییەکانی نووسەر لە بواری زمانەوانی دا:

١١- لێکۆڵینەوەیەك لەسەر :
جێ گۆڕکێی جێناوی لکاو، رۆڵی بەرکار گۆڤاری کاروان ژمارە (٢)، دووەم ١٩٩٢.

١٢- بەستنی کۆڕو سیمینار لە ئەمستردام و لە پاریس لەسەر :
(Programmable grammar of the Kurdish language)
لە بلاّوکراوەکانی زانکۆی ئەمستردام، پەیمانگای مونتیق و زمان و کۆمپیوتەر، ژمارە (LP-95-O2) و تۆمارکراوە بە ژمارە (ISSN:O 928-3307).

١٣- کتێبی (رستە سازی و شیتەڵکاری زانستی) هەولێر ١٩٩٦.
١٤- ئەم کتێبەی بەردەست.

# له چاپکراوه‌کانی وه‌زاره‌ت

| | |
|---|---|
| ١. کاولاش ... رۆمان | عبدا لله سراج |
| ٢. مه‌م و زین | علی فتاح دزه‌یی |
| ٣. پشکۆ و خوڵه مێش | ئازاد عبدوالواحد |
| ٤. ده‌رده کورد | محمود زامدار |
| ٥. باڵه‌بان | وریا احمد |
| ٦. چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی | محمد روشدی دزه‌یی |
| ٧. کوردستانی خوارووی رۆژهه‌لات | د. رشاد میران |
| ٨. وشه و زاراوه‌کانی بابه تاهیر | د. محمد نوری عارف |
| ٩. حه‌مه‌دۆك | یشار کمال |
| ١٠. کورته‌یه‌ك ژ دیرۆکا ئوقیانوسا | د. بێوار خنسی |
| ١١. رۆمانی درز | کاکه مه‌م بۆتانی |
| ١٢. میکانزمه بنه‌ره‌تیه‌کانی رسته سازی | د. شێرکۆ بابان |

قواعد اللغة الكردية

# آلية النحو الأساسية

## قواعد أفعال الكينونة والتملك

د.شيركو بابان

*KURDISH GRAMMAR*

# FUNDAMENTAL MECHANISMS OF SYNTAX

## GRAMMAR OF **BE** & **HAVE**

SHERKO BABAN

ژمارەی سپاردن ۱۹۷ ساڵی ۱۹۹۷ هەولێر

چاپخانەی ئۆفسێتی کوردستان/هەولێر